


# بانگی کوردستان

کۆکردنەوە و لەسەر نووسینی

جەمال خەزنەدار

صاحب امتياز و مدير مسئول
و سر محرر
مصطفى پاشا

ملاقات بدبريت
۳ آنه ده سيئريت

همو شتيك مراجعت
به صاحب امتياز اكرى

# بانگ كردستان

تحرير كردى و فارسى
على كمال و م . نورى

بوداخل شهر و ا... بونه
۳ مانك دو ٦ مانك چوار
ساليكى ۸ روپيه يه

بوخارج اجرت پوسطه
زياده ده كرى

(زمان كوردو و م رابوردو ايستا پالوان علمه)
(سلاح دسته صنعت بارقهٔ تيغ و سنان علمه)

تاريخ انتشار
۲ آغستوس ۲۲ ...
سالى ...

علمى ، اجتماعى ، ادبى ، غزته يكى حر و سربست ملى يه
هفته‌ٔ جاريك دردچى
نسخه يكى به ۲ آنه ده فروشرى

وەزارەتی ڕاگەیاندن
بەڕێوەبەرێتی ی گشتی ی
ڕۆشنبیری ی کوردی




١٩٢٢ _ ١٩٢٦

کۆکردنەوە و لەسەر نووسینی

جەمال خەزنەدار

بەغدا ١٩٧٤

لمحة

« نداء كردستان »

جريدة علمية ، اجتماعية ، ادبية ، قومية ، حرة مستقلة ، اسبوعية ، كانت تصـــدر في مدينـــة السليمانية ، صاحب امتيازها ومديرها المسـؤول ، مصطفى پاشا ياملكى ، وكان يحرر فيها كل من رفيق حلمى ، وعلي كمال باپير آغا والشيخ نوري شيخ صالح • صدر منها (١٤) عددا في مدينة السليمانية حيث صدر العــدد الاول منهـــا في ٢ آ ١٩٢٢ والعدد الرابع عشر في ٨ حزيران ١٩٢٣ كمــا وصدر منها ثلاثة اعداد اخرى في مدينــة بغـــداد في سنة ١٩٢٦ ، والجدير بالذكر انها كانت لسان « جمعية كردستان » التي تأسست في يوم الجمعة الموافق ٢١ تموز ١٩٢٢ برئاسة مصطفى پاشـــا ياملكي ، ثم صارت الجريدة تنطق باسم حكمدارية الشيخ محمود الحفيد •

قام السيد جمال خزنەدار رئيس شـــعبة الصحافة في هذه المديرية بجهد مشكور وقيم وذلك بجمع الاعداد الكاملة وتدقيقها وتقديمها الينـــا لذا ... آثرنا طبعها في هذا الكتاب احياءا للتراث الكردي ، وخشية من ضياعها ، وخـدمة لنشـر الثقافة امام الجميع بأسهل السبل ••

الدكتور أحسان فؤاد
مدير عام الثقافة الكردية

# پێشەکی

دەبوایە یەکەم کتێبمان لە « زنجیرەی ژیاندنەوەی ڕۆژنامە و گۆڤاری کوردیدا » ڕۆژنامەی « بانگی کوردستان » بوایە ، ئەوەی کە ئێستاکە لەبەر دەستدایە ، چونکە ڕۆژنامەی « بانگی کوردستان » پێش ڕۆژنامەی « ڕۆژی کوردستان » بڵاوکراوەتەوە ، هەر چەندە هەردووکیان لە ناوەرۆکدا لەسەر یەك ڕێبازدا دەرۆیشتن • بەڵام لە کاتی خۆیدا لەبەر نەبوونی هەموو ژمارەکانی « بانگی کوردستان » لە لامان‌دا ، ناچاربووین بە هۆی یۆبیلی (٧٥) ساڵەی ڕۆژنامەی « کوردستان » یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی کە لە ٢٢ی نیسانی ساڵی١٩٧٣دا بوو ، کتێبی «ڕۆژی کوردستان» بکەین بە ئەلقەی یەکەمی « زنجیرەی ژیاندنەوەی ڕۆژنامە و گۆڤاری کوردی » •

دیاره پاش دامەزراندنی حوکوومەتی کوردستان لە ناوچەی سلێمانی ، بەسەرۆکایەتی شێخ مەحموود ، لە مانگی تشرینی دووەمی ساڵی **١٩٢٢**ی زاییندا ، پاش گەڕانەوەی بۆ ووڵات لە ئاوارەییەکەی ( کوێت )یدا وە دامەزراندنی خاوەنی ئیمتیاز و بەڕێوەبەری بەرپرسیاری ڕۆژنامەی « بانگی کوردستان » مستەفا پاشا یامولکی بە وەزیری مەعاریف دەردەکەوێ کە •

صورت ارادە علیە حضرت حکمدار کردستان عدد ـ ٢
لە مملکت سلیمانیدا نوسرا •

بۆ تەشکیلاتی حکوومەتی کوردستان نەسب و تەعینی ئەم زاتانەم لە قابینەی حکوومەتدا موناسب دی •

| | |
|---|---|
| سپهسالار | شیخ قادر |
| رئیس داخلیه | شیخ محمد غریب |
| رئیس مالیه | عبدالکریم علکه |
| رئیس معارف | میر لوا مصطفی پاشا |
| رئیس شرع و عدل | ••••••••••• |
| رئیس کمرك | أحمد بك فتاح بك |
| رئیس نافعة | محمد آغای عبدالرحمن آغا |
| رئیس امنیت عمومیه | سید أحمد برزنجی |

مفتش عموم حکومت کردستان میر لوا صدیق القادری پاشا هەرکەسە مەقامی وەزیفەی خۆیم پێسپاردن و ئیرادە ئەکەم دەرحال دەست بە تەدویری ماکینەی حکوومەت بکەن •

ومن الله التوفیق

حکمداری کوردستان
محمود

پێرەوی ئەوە کراوە وە بە پێویست زانراوە کە خاوەن و بەرپرسیاری ڕۆژنامەکە بگۆڕێ و لە هەمان کاتدا بوونی ڕۆژنامەیێکی ڕەسمی زمانی حاڵی حکوومەت پێویست بووە ، لەبەر ئەوە ڕۆژنامەی « ڕۆژی کوردستان » بڵاو کراوەتەوە •

ڕۆژنامەی « بانگ کوردستان »ی « علمی ، اجتماعی ، أدبی ، حروسربستی میلی » هەفتەی جارێك بە ناوی ڕێکخراوی « جەمعیەتی کوردستان » لە شاری سلێمانی خاوەنی ئیمتیاز و بەرپرسیاروسەرنووسەر ، مستەفا پاشا یامولکی بڵاوی دەکردەوە •

ناوچەی سلێمانی لە مێژە مەڵبەندێکی گەورەی هوشیار کردنەوەی ڕۆشنبیری‌ی کوردبووە ، ئێستاش ئەو جڵەوە هەر بەدەست ئەو ناوچەیەدایە و هەر پاڵپیوەنەری ڕاستەقینەی بزووتنەوەی ڕۆشنبیری‌ونەتەوایەتی کوردی بووە و کارێکی گەورەی کردۆتە سەر ناوچەکانی تری کوردستان •

دامەزراندنی یەکەمین چاپخانە لە ناوچەی سلێمانی ، لە ساڵانی شەڕی یەکەمی جیهانی‌دا ، هۆیێکی ئێکجار گەورە بوو ، بۆ بڵاوکردنەوەی بیری نەتەوایەتی و هوشیاری ڕۆشنبیری‌ی و زانینی هەواڵی سیاسی‌ی هەندەران •• زانین و گەیشتنی هەواڵی سیاسی گێتی‌ی ئەو سەردەمە بۆ کوردستان ، ڕاستی‌یێکی مێژوویی بێ‌گەردە کە میللەتی کورد ئازاو زیرەك و زۆرزانە ، پێویستە دەوری خۆی لە ناو کۆمەڵی گێتی‌دا بگێڕێ وەکو میللەتێکی حەق‌خوراو بە ئامانج نەگەیشتوو لە ( کوردستان)ە دابەشکراوەکەیدا •

بە ڕێگای ئەو چاپخانەیەو چاپخانەکانی‌تری کوردستان و دەرەوەی کوردستان ، لە ڕواندزو هەولێرو وورمێ‌و ئەستەموول و کەرکوك‌و سنەو

سابلاخ‌و بەغداو قاهیرە وباکۆ و یەریڤان‌بەیاننامەو کتیب‌و ڕۆژنامەو گۆڤاری ڕێکخراوە کوردی‌یەکان بــە زمانی کوردی‌و زمانانی دراوسێی کــورد بلاودەکرایەوە بـــە هەمووولایێک‌دا ، ناوەوەو دەرەوەی کوردستان ، وە دەبووە دەســتکەوتێکی فیکری بــۆ بەرزکردنەوەی پلـــەی هوشــیاری وڕۆشنبیری‌و نەتەوایەتی لای میللەتی کورد • ئــــەم سەرووتارەی ژمارە (١)ی ڕۆژنامەی « بانگی کوردستان » ئەم ڕاستی‌یەمان دەخاتە پێش‌چاو :

# جەمعیەتی کوردستان

« لەسەر موراجەعەتی جەنابی سەعادەت مەئاب حاجی مستەفا پاشای میر لوای ئەرکانی حەربی موتەقاعید و لە سەر مەئذوونیەت‌و موساعەدەی ڕەسمی حکوومەتی سیاسی سلێمانی ، لە تەرەف بەعزێ ئەربابی حەمیەت و ئەفازل‌و مونەوەرانەوە قەرار درا کە لە سلێمانی جەمعیەتێکی کوردی تەشکیل بکا • بۆ ئەمە چەند ڕۆژێ لەمەوپێش ئەسامی عولەماو مەشایخ و ئەشراف و سائیری مونەوەران‌و ئەهلی کەسەبە بە تەرتیبی حرووفی هیجا داخیلی دەفتەر کراو ڕۆژی جومعەی ٢١ی تەمووزی ١٩٢٢ پاش نوێژی نیوەڕۆ لە مزگەوتی ســەید حەسەن مفتی‌دا گردبوونەوە • لــە تەرەف جەنابی مستەفا پاشــاوە نوتقێکی ئیفتیتاحی دایر بە مەقسەدو غایەی ، ئەم ئیجتیماعە خوێندرایەوە ، سامعین کە بیستیان غایەی ئەم فیکرە بۆ تەرەقی و تەعالی میللەت و وەتەنە بە کەماڵی ئیفتیخار قبوولیان فەرموو •

بڵاوکردنەوەی ئەم فیکرەیش بە واستەی ئـــەم غەزەتەیەوە کــــە حکوومەت ئیمتیازی داوە بە جەنابی مستەفا پاشاو ئێستا هەفتــەی جارێك دەردەچێ ، ئومید وایە ئینشائەڵلا بە واستەی هیمەتی ئەربابی حەمیەتەوە تەرەقی بکات زاتەن هەموو شتێك ووردە ووردە زیاد ئەکات •

بۆ تەماشاکردنی ئەم غەزەتەیەو سائیر ئومووری ئیدارەی ئەم جەمعیەتە لە تەرەف حوزەرای کیرامەوە لە ژێر ریاسەتی پاشای موشارئیلەیهیدا (١٣) کەس بۆ ئەعزایەتی ئینتیخاب کران ، ناویان و عەدەدی رایان بەم ڕەنگەیە •

| عەدەدی ڕای | ناو |
|---|---|
| ٦٥ | ڕەفیق حیلمی ئەفەندی |
| ٦٢ | ئەحمەد بەگ تۆفیق بەگ |
| ٥٤ | سالح ئەفەندی قەپتانچی |
| ٤٥ | فایق بەگ مەعرووف بەگ |
| ٤١ | حاجی ئاغا فەتحوڵلا |
| ٣٩ | عیزەت بەگ عوسمان پاشا |
| ٣٨ | ئەدهەم ئەفەندی یوزباشی |
| ٣٦ | ئەحمەد بەهجەت ئەفەندی یوزباشی |
| ٣٢ | شێخ محەمەد ئەفەندی گوڵانی |
| ٣١ | شێخ عەلی ئەفەندی سەرکار |
| ٢٩ | عەلی ئەفەندی باپیر ئاغا |
| ٢٤ | عەبدوڵلا ئەفەندی محەمەد ئەفەندی |
| ٢٤ | شوکری ئەفەندی عەلەکە • |

ئیتر ئومێدمان وەهایە کە بۆ تەرەقی و تەعالی وەتەن و میللەت هەموو لایێك تێبکۆشی و ئەگەر قسوورێك ببینرێ بەبێ ئەمەی لەملاو لەولا بەحس و تەنقید بکرێ پیاوانە خەبەر بە جەمعیەت بدرێ تاوەکو بە پێی ئوسوول جەمعیەت ئەو مەسەلەیە فەورەن داخیل موزاکەرە بکرێ و نەتیجەی بە واستەی غەزەتەوە ئیعلان بکرێ •

لەم خسووسەوە وا ئەزانم لەمە زیاتر بەسەتی مەقال زایدە ، ئەمە قانونێکی تەبیعی‌یە کە لە عەسری یازدەهەمی هیجری‌یە وە یەعنی لە تاریخەوە کە غەزەتە پەیدا بووە هەر قەومێ ڕەغبەتی بە مەعاریف و بەم واستە موقەدەسە کردبێ بە تەدریجی تەرەقی کردووەو ئەگەر وەکو ئێمە مابێتەوە لە ناو ئەقوامی موتەمەدینەدا بێ نامو نیشان ماوەتەوە ینائەن عەلەیهی ئێمەیش لەسەرمان لازمە کە بۆ تەرەقی و تەعالی کوردستان ڕەغبەت بەم واستەیە بدەین کە بۆ تەرەقی عیلمو مەعاریف فال خیرە • باقی تۆفیق لە خودا و معاوەنەت و غیرەت لە ئەربابی حەمیەت تەمەنا دەکەین » •

ڕۆژنامەی « بانگی کوردستان » یەکێکە لە ڕۆژنامە هەفتەیی‌یە پێشکەوتووەکانی سالانی بیست کە بە زمانی کوردی بلاوکراوەتەوە ، خاوەنی ئیمتیازو بەرپرسیارو سەرنووسەری مستەفا پاشا یامولکی و دەستەی نووسەرانی ڕەفیق حیلمی و عەلی کەمال و م• نووری ( شێخ نووری شێخ سالح ) بوون ، ژمارەی یەکەمی لە ڕۆژی چوارشەمەی ۸ی زیلحەجەی سالی ۱۳٤۰ی کۆچی ( ۲ی ئاغستوسی سالی ۱۹۲۲ی زایین ) بلاوکراوەتەوە ، ژمارە دووی هەتا ژمارە (٦)ی ڕۆژانی دووشەمووان دەرچووە ، ژمارە (۷) و ژمارە (۸)ی لە ڕۆژانی جومعەدا دەرچووە ، ژمارە (۹)و ژمارە (۱۰)ی لە ڕۆژانی یەکشەمووان‌دا دەرچووە، وە ژمارە (۱۱) تا ژمارە (۱٤)ی لە ڕۆژانی جومعەدا دەرچووە • ئەوەی شایانی باسە لێرەدا ئەوەیە کە ژمارە (۱٤)ی پاش وەستانی هەشت مانگ دووبارە لە ڕۆژی‌جومعەی ۲۳ی شەوالی سالی ۱۳٤۱ی کۆچی (۸ی حوزەیرانی سالی ۱۹۲۳ی زایین ) دەرچۆتەوە •

ـ لێرەدا پێویستە ئەو ڕاستی‌یە تۆمار بکەم ، هەروەکو لە سەرەوە گوتم ، لە دەمێکەوە خەریکی گردکردنەوەی ڕۆژنامە و گۆڤاری کۆنی کوردی بووم • لە ئەنجامی هـەوڵو کۆشش و ســەروسۆراخی ئەم ڕۆژنامەدا ، بـۆم دەرکەوت کــە ڕۆژنامەی « بانگی کوردستان » پاش چوارده ژمارەکەی ، سێ ژمارەی تریشی لە بەغدا لێ‌دەرچووە • بەڵام دەسکەوتنی ئەم سێ ژمارەیە کارێکی گــەلێ قووس بوو زۆر بە دوایان گەڕام ، بۆم نەدۆزرانەوە • ناچاربووم پــەنا بەرمە بەر ئەو کەسانەی ئاگادارن • لە سلێمانی هەموو نامەخانە گشتی‌ی و تایبەتی‌یــەکان گەڕام نەبوون ، هەروەها لە کەرکووکو هەولێریش • لە بەغدا دوو سێ جار لە مامۆستا سوجادی‌م پرسی ، ئەویش تەئکیدی لە سەر ئەوە دەکردەوە کــە ئەو زانیاری‌یانەی لەم بابەتەوە لە کتێبی مێژووی ئەدەبی کوردی‌دا نووسیوە لە کاتی خۆیدا لە جەمیل سائیب و فوزی سائیب بیستووە ••

بە کتێبخانەی کۆری زانیاری کورددا گەڕام نەبوون •• هاوڕێی بەڕێزم کاك حوسێن جاف ئەمینداری کتێبخانەی‌کۆری زانیاری کورد ، ئاگاداری کردم ، کە لە کتێبخانە تایبەتی‌یەکــەی خۆی ئەم سێ ژمارانە دەست دەکەون و بەوپەری خۆشی و دڵنیایی ئامادەیــــە بمداتی و بڵاویان بکەمەوە • ســوپاسێکی بێ‌پایانی هــەموو ڕۆشنبیرانی کوردی پێشکەش دەکەم • ئەو سێ ژمارەیە بە قەوارەی ڕۆژنامەی ئاسایی دەرچووە ، کــە ئەمە یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی‌یە ، لـــە مێژووی ڕۆژنامــەگەری‌ی کوردی‌دا بەم قەوارەیە دەربچێ ••

مستەفا شەوقی نووســـەری بووە ، وە کــەریم ڕوشتەم مودیری ئیدارەی ، هەر سێ ژمارەکــە لە چاپخانەی ( دار الســـلام ) لە بەغدا چاپ کراوە ••

وا لـــه خوارەوەدا ڕۆژی دەرچوونی هـــەموو ژمارەکان دیاری دەکەین :

١ ـ ژمارە (١) ٨ی ذیئەلحـــەجەی، ســـاڵی ١٣٤٠ی کۆچی ـ ٢ی ئاغستۆسی ساڵی ١٩٢٢ یزایین •

٢ ـ ژمارە (٢) ٢٠ی زیئەلحەجەی ســـاڵی ١٣٤٠ یکۆچی ـ ١٤ی ئاغستۆسی ساڵی ١٩٢٢ یزایین •

٣ ـ ژمارە (٣) ٢٧ی زیئەلحەجـــەی ساڵی ١٣٤٠ یکۆچی ـ ٢١ی ئاغستۆسی ساڵی ١٩٢٢ •

٤ ـ ژمـــارە (٤) ٥ی موحـــەرەمی ســـاڵی ١٣٤١ یکۆچی ـ ٢٨ی ئاغستۆسی ساڵی ١٩٢٢ یزایین •

٥ ـ ژمارە (٥) ١٢ی موحــــەرەمی ســـاڵی ١٣٤١ یکۆچی ـ ٢٨ی ئاغستۆسی ساڵی ١٩٢٢ ی زایین •

٦ ـ ژمارە (٦) ٢٦ی موحـــەرەمی ســـاڵی ١٣٤١ یکۆچی ـ ١٨ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٢٢ یزایین •

٧ ـ ژمارە (٧) ٣٠ی موحــــەرەمی ســـاڵی ١٣٤١ یکۆچی ـ ٢٢ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٢٢ یزایین •

٨ ـ ژمارە (٨) ٧ی سەفەری ساڵی ١٣٤١ یکۆچی ـ ٢٩ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٢٢ • یزایین •

٩ ـ ژمارە (٩) ١٦ی سەفەری ساڵی ١٣٤١ یکۆچی ـ ٨ی تشـــرینی یەکەمی ساڵی ١٩٢٢ی زایین •

١٠ـ ژمارە (١٠) ٢٣ی سەفەری ساڵی ١٣٤١ یکۆچی ـ ١٥ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٢٢ی زایین •

١١- ژماره (١١) ٢٨ی سەفەری ساڵی ١٣٤١ ی کۆچی - ٢٠ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٢٢ ی زایین •
١٢- ژماره (١٢) ٥ی رەبیعولئەوەلی ساڵی ١٣٤١ ی کۆچی - ٢٧ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٢٢ ی زایین •
١٣- ژماره (١٣) ١٢ی رەبیعولئەوەلی ساڵی ١٣٤١ ی کۆچی - ٣ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٢٢ ی زایین •
١٤- ژماره (١٤) ٢٣ی شەوالی ساڵی ١٣٤١ ی کۆچی - ٨ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٢٣ ی زایین •
١٥- ژماره (١٤ - ١) کە دەکاتە ژماره (١٥) لە ١٤ی رەجەبوئەلفەردی ساڵی ١٣٤٤ی کۆچی - ٢٨ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٢٦ ی زایین •
١٦- ژماره (١٤ - ٢) کە دەکاتە ژماره (١٦) لە ٢ی شەعبانی ساڵی ١٣٤٤ی کۆچی - ١٥ی شوباتی ساڵی ١٩٢٦ی زایین •
١٧- ژماره (١٤ - ٣) کە دەکاتە ژماره (١٧) لە ١٨ی ڕەمەزانی ساڵی ١٣٤٤ی کۆچی - ١ی نیسانی ساڵی ١٩٢٦ی زایین •

لە ژماره (١٤)ی ڕۆژنامەکە ڕوونکردنەوەیەك نووسراوە ، کە گوایە دواکەوتنی ڕۆژنامەکە لە بلاوکردنەوە ، لەبەر تەنگو چەڵەمەی چاپەمەنی و نەبوونی تیپ بووە ، بەڵام زۆر ئاشکرایە وەستانی ڕۆژنامەی « بانگی کوردستان » لە ماوەی ئەو هەشت مانگەدا ، لەبەر ئاڵۆزی و شێوانی کاروباری حکوومەتی شێخ مەحموود بووە ، نەك لەبەر :

« لەبەر بەعزێ ئەسباب و موانیع لە پاش نوسخەی (١٣) وامان بە مو ناسیب زانی بوو کە تەعتیلی نەشریات بکەین ، ئێستا موستەعینەن بە ئیلا غەزەتەی « بانگی کوردستان » کەوتە ساحەو ئینتیشار و چونکە لەم رۆژان مەعلوومیدا لە تەرەف مەتبەعەدا نوقسانی پەیدا بووە تا تەواو کردنی ئەو نوقسانە مەجبووری غەزەتەکەمان هەر چوار سەحیفە دەردەچێ ، فەقەت ئەمەیش موتەوەقیفە بە موعاوەنەت و هیمەتی حەمیەت مەندانی وەتەن . »

وە دیارە بەڕێوەبەرانی ڕۆژنامە تەنیا ژمارە (١٤) یان لەسلێمانی بلاوکردۆتەوە و ئیتر پەکی کەوتووە و نەیانویستووە لەو ڕێبازەی بۆی دیارکراوە لابدەن و بە ڕێگایێکی چەوتی دوور لە هیواو ئامانجی میللەتی کورد بیبەن بەڕێوە ..

سێ ژمارەکەی لە بەغدا چاپ کراوە ، بەقەوارەی ڕۆژنامەی ئاسایی دەرچووە و بە چوار لاپەرە ، د. . ن بە دوو ئانە فرۆشراوە ..

دیارە مستەفا پاشا دوای دامەزراندنی حکوومەتی ئەهلی لە عیراق و بلاو کردنەوەی بڕیارەکانی (عصبة الامم) خۆی تەخۆ بە بلاوکردنەوەی ڕۆژنامەی ( بانگی کوردستان ) بۆ جاری سێیەم بە نیازی ژیاندنەوەی کۆمەڵـەی کوردستان و هوشیارکردنەوەی هەستی نەتەوایەتی لــــە کن ڕۆلەکانی کوردو بتەوکردنی دۆستایەتی کوردو عەرەب .

ئەگەر بێتو بە ووردی تەماشای لاپەرەکانی « بانگی کوردســـتان » بکەین ، زۆر شتمـــان بۆ ڕوونەبێتەوە ، لەوانـــە ئەو هەول و تەقەللا بێووچانەی بابو باپیرانمان داویانە بۆ چەسپاندنی مافی ڕەوایی نەتەوایەتی کورد ، بۆ بەرزکردنەوەوقالکردنی بزووتنەوەی ڕۆشنبیریی کوردی ،

بۆ نەهێشتنی نەخوێندەواری و هوشیارکردنەوەی میللەت ، بۆ بڵاوکردنەوەی دەنگوباسی گێتی‌ی بۆ تیژکردنی بیروهۆش •

ڕۆژنامەی بانگی کوردستان لە ژمارە (١) هەتا ژمارە (١٣) بە شەش لاپەڕەی قەوارە (٣٤سم × ٥ر٢١سم ) ( تێکست ٥ر٢٨سم × ١٧سم) ، تەنیا ژمارە (١٤)ی بە چوار لاپەرە دەرچووە ، ئەوەی شایانی باسە لە سەر هەموو ژمارەکان نووسراوە دانەی بە (٢)ئانە دەفرۆشرێ وە لەسەر ژمارە (١٤) نووسراوە دانەی بە یەك ئانە دەفرۆشرێ ، کەچی لەگەڵ ئەوەش‌دا لە ژمارە (١) نووسراوە :

« ئەم ئەوەل نوسخەیەی تەبەروکەن وە مەجانەن تەوزیع و تەقدیمی برادەرانی وەتەن دەکرێ » •

وە ژمارە «١٥ و ١٦ و ١٧» بە چوار لاپەڕەی تێکستی (٥٠سم × ٣٨سم ) دەرچووە •

مێژووی خوێناوی کورد وامان بۆ دەگێرێتەوە کە سوور بوونو کۆڵ‌نەدان لەسەر هەڵویستی ڕاستەقینەی کوردایەتی زیاتر ئامانجو ئاواتی کورد بەرەو چەسپاندنو دانپیانان دەبات ، بۆ ... با چاو بەم خەبەرە بخشێنین :

« ئەڵێن هەیئەتی ناسیحە لە بەغدادەوە دێن »

لەم ڕۆژانەدا شایعەیێك هەیە دەڵێن هەیئەتێکی ناسیحە لە بەغدادەوە دێت بۆ کوردستان •

١ ـ تێی‌ناگەین ئەم هەیئەتە بە ئەمری کێ دێت بە تەنسیبی چ کەسانێ ڕێك‌خراوە ؟

٢ ـ نازانین ئەمانە کە دین نەسیحەتی چیمان دەکەن ؟

٣ ـ ئەگەر مەقسەدیان ئەمەبێ نەسیحەتمان بکەن تابیعی عیراق بین وەختی خۆی لام باش نی‌یە بێزراوە ، وە فیکری کوردایەتی هەتا بێت ڕەگ

دادەکوتێ و « بانگی کوردستان » لەگـەڵ مەعاریف بۆ تەرەقی ز
تەنویری کوردان سەعی و کۆشش دەکات •

ئەمجا لەبەر ئەمە نازانین ئەم هەیئەتە ناسیحە دین چی دەڵێن • •

مەبەستمان لە بڵاوکردنەوەی ئەم ڕوژنامەیە ڕوونو ئاشکرایە ، وە گومان لەوەدا نی‌یە کە پسپۆرو مێژوونووس و خوێنەوارانی کورد بـە چاوێکی ووردبین سـوود لە ناوەرۆکی وەربگرنو بە شێوەیێکی فـراوان لێی بکۆڵنەوە••

زنجیرە (٣)ی « ژیاندنەوەی ڕۆژنامەی گۆڤاری کوردی » ، سـێ ژمارەکەی ( رۆژی کورد ) دەبێ لەگەڵ تەرجومەی ناوەرۆکیان بـە عەرەبی ••

**بەغدا : ١ ی مارتی ١٩٧٤ •**

**جەمال خەزنەدار**

# ناوەرۆکی ڕۆژنامەکانی
# « بانگی کوردستان »

## ژمارە (١)



## ژمارە (٢)

## ژمارە (٣)



## ژمارە (٤)

## ژمارە (٥)



## ژمارە (٦)

## ژمارە (٧)

## ژماره (٨)



## ژماره (٩)

## ژمارە (١٠)

## ژماره (١١)



## ژماره (١٢)

## ژمارە (١٣)

لاپەڕە



## ژمارە (١٤)

لاپەڕە

## ژمارە ( ١٤ ــ ١ ) کەدەکاتە ژمارە (١٥)

## ژماره (١٤ ـ ٢) ـەکانه ژماره (١٦)

## ژماره ( ١٤ ـ ٣ ) كەدەكاتە ژمارە (٧ ...

صاحب امتیاز و مدیر مسئول
مصطفی پاشا

محرر توركی
رفیق حلمی

محرری کوردی و فارسی
[illegible]

[illegible]
[illegible]

در خارج بدل آبونه‌ی
٣ مانگی دو ٦ مانگی چوار
سالیکی ٨ روپیه‌یه
اعلانات به دو دیر
٥ آنه ده پذیریت

# بانگ کردستان

(زمان کوردو رم رابوردو ایستا پالوان علمه)
(سلاح دسته صنعت پارهٔ تیغ سنان علمه)

نسخه‌یکی به ٢ آنه — علمی ، اجتماعی ، ادبی ، فرقه‌یکی حر و سربست ملی‌یه . — ٢ آغستوس ١٩٢٢
هفتهٔ جاریك دردچی

سال ١ ژماره ١ [ چوارشمه ] ٨ ذی الحجه ١٣٤٠ ٢ آغستوس ١٩٢٢

## جژنی قربانه

تقرب و حلول ام جژن قربان مبارکه که بو همو [illegible] اسلام موجب فیض ورحمته بانك کردستان بواسطهٔ ام روژه مبارکه‌وه بو همو افراد جمعیت و بو اهل کردستان له یزدان پاك تمنا و نیاز نجات وسعدت و عرض جژنه پیروزی دکات .

بانگ کردستان

اول روژ جژن قربان پاش نویژی جژن اعضایان [illegible] جمعیت کردستان له مال جناب حاجی مصطفی پاشادا اجتماع دکن . بو جژنه پیروزی لکل یکتر لو وخته‌دا تشریف فرمون همو افراد جمعیت کوردستان رجا اکین .

..

## جمعیت کردستانه

لسر مراجعتی جناب سعادتمآب حاجی مصطفی پاشای میرلوای ارکان حرب متقاعد و له [illegible] مأذونیت و مساعدهٔ رسمی حکومت سیاسی سلیمانی‌یه له طرف بعضی ارباب همت و افاضل و منورانه‌وه قرار درا که له سلیمانی جمعیتیکی کورد تشکل بکا . بو امه چند روژی لو پیش اسامی علما و مشایخ و اشراف و سائر منوران و اهل کدبه به ترتیب حروف هجا داخل دفتر کرا و روژی جمعه ٢١ تموز ٩٢٢ پاش نویژی نیوه‌رو له مزکوت سید حسن مفتی‌دا کرد بونه‌وه . له طرف جناب مصطفی پاشاوه نطقیکی افتتاحی دایر به مقصد وغایهٔ ام اجتماعه خوینرایه‌وه سامعین که بیستیان غایهٔ ام فکره بو ترقی و تعالی ملت و وطنه به کمال افتخار قبولیان فرمو .

بلاو کردنه‌وهٔ ام فکره‌یش بواسطهٔ ام غزته‌یه‌وه که حکومت امتیازی داوه به جناب مصطفی پاشا و ایستا هفتهٔ جاریك دردچی . [illegible] انشاالله بواسطهٔ همت ارباب حمیته‌وه ترقی بکات ذاتاً همو شتیك ورده ورده زیاد اکات .

بو تماشا کردنی ام غزته‌یه و سائر امور ادارهٔ ام جمعیته له طرف حضار کرامه‌وه له زیر ریاست پاشای مشار الیهدا ( ۱۳ ) کس بو اعضایتی انتخاب کران ناویان و عددی رأی‌یان بم رنکه‌یه

| عدد رأی | |
|---|---|
| ٦٥ | رفیق حلمی افندی |
| ٦٢ | احمد بك توفیق بك |
| ٥٤ | صالح افندی قبطانچی |
| ٤٥ | فایق بك معروف بك |
| ٤١ | حاجی آغا فتح الله |
| ٣٩ | عزت بك عثمان پاشا |
| ٣٨ | ادهم افندی یوزباشی |
| ٣٦ | احمد بهجت افندی یوزباشی |
| ٣٢ | شیخ محمد افندی کلالی |
| ٣١ | شیخ علی افندی سرکار |
| ٢٩ | علی افندی باپیر آغا |
| ٢٤ | عبدالله افندی محمد افندی |
| ٢٤ | شکری افندی حاکه |

ایتر امیدمان وهایه که بو ترقی و تعالی وطن و ملت همو لایك تی بکوشین و اگر قصوریك ببینری به بی امه‌ی لم لاو لولا بحث و تنقید بکری بیاوانه خبر به جمعیت بدری تا وکو به پی اصول جمعیت لو مسئله یه فوراً داخل مذاکره بکری و نتیجهٔ به واسطهٔ غزته وه اعلان بکری .

لم خصوصه‌وه وا ازانم له زیاتر بسط مقال زائده امه قانونیکی طبیعی‌یه که له عصر یازده‌هم هجری‌یه‌وه یعنی لو تاریخه‌وه که غزته پیدا بوه هر قومی رغبتی به معارف و به ام واسطه مقدمه کردبی به تدریجی ترق کردوه و اگر وکو ایمه مابیته‌وه له ناو اقوام متمدنه‌دا بی نام و نشان ماوه‌ته‌وه . بناءً علیه ایمیش له سرمان لازمه که بو ترقی و تعالی کردستان رغبت بم واسطه‌یه بدەین که بو ترقی علم و معارف فال خیره . باقی توفیق له خدا ومعاونت و غیرت له ارباب حمیت تمنی ده‌کین .

السلام علیکم ای کردان ای قوم قدیم پهلوی کوی بکرن له ( بانگ کردستان ) ام بانگه بو خبرداری همو کردانه بو هشیاری شیرانه بو بیستن باوك و دایکانه کوی بکرن ام بانگه چی تیایه ام هاواره بو چیه همو هفته‌یك کوی لی بدن بزانن آخری چیه قصه‌ی پرو پوچ کولانان درو هالبستن و ژکاوان بسه تماشای عالم بکن له صنعت و معرفتدا له ایمه پاشکوتوتر کی هه‌یه کالایکان نیه بو ستر عورتمان کافی بی درزی و دزییکمان نیه که دستکرد ولاتمان بی نشانهٔ عظمت و خاندانیش که ایستا عبارت له شکر و چایه اوانه‌یش هی کردستان نیه له جیکایان دور دیتن پارچه کاغذی که بو نوشته‌ی چورو شیرینی بی اویش له فرنکستانه‌وه دیت له صدا چوارمان تیانیه که کاغذی بو کس و کاری و سریکی محرمی بو عائله‌ی خوی بنوسی . مشکی و میزرمان له ایران و فرنکستان کورونی کل لوقه‌یی‌مان له هندوستان عبای کوره کوره‌ی نازدارانمان له عربستان کفن مردومان له اوروپاوه ملوتکه‌ی مندالمان له امریقاوه دیت .

والحاصل له همو چشتیك محرومین له حوادث عالم بی خبرین امه همو سببی بی علمی یه له فنون جهان بی بهره یی یه له کل امه‌یشدا هر یکتری تنقید و هر کس ایش بکاله پیش پینی نتیجه‌ی لبر جهل و حسودی او ایشه بخرابی تاویل ده‌کین ای برادران کردان ورن کوی له بانك کوردستان بکرن بزانن چی لی حاصل ده‌بی چه ثمره‌یك ده‌دا حسن نیت و برادری سبب سرفرازی یه نفاق و غیبت باعث پریشانی و رو سیاهی یه زمان کوراوه علم و دانش بسر همو کاریکا حاکمه کوی بکرن له بانك کوردستان دلی ( زمان کورزورم رابورد و ایستا پالوان علمه . سلاح دسته صنعت بارقهٔ تیغ و سنان علمه هر کس فکریکی چاکی هیه و بو اولاد وطن و ملت به خیری ده‌زانی به

پیاوەتی آشکاریکا تا لە دائرهٔ علم و ادبدا بخوینریتەوە قصەی پروپوچ شوان بدریتەوە اوابانك کردستان دست پی کرا اوا پند و ناصح برادری بە آشکاری نوسرا .

بی علم و سیاست ای بقربان
محال اندر محالە زین کردان

قصە خوشە نقط چاکی لە دوبی
ئەوك بو روپیە و تحکیم جی‌بی

لە ترس دنك پولیس سر بکون کا
بە پنهانی دو صد فتنە پیاکا

صاحب امتیاز میرلوا
مصطفی

بانك کوردستان

لە نتیجهٔ سعی و کوشیشیکدا کە لە طرف جناب رئیس جمعیت کوردستانەوە واقع بوە حکومت سیاسی سلیمانی بو نشری غزتهٔ ( بانك کردستان ) مساعدهٔ فرمو .

مقصد لم غزتەیە چونکە رەبری و خدمت بو قوم کردانە لەسر همو کوردیك لازمە ام غزتەیە بخوینیتەوە و بە دل کومکی لی بکری .

معلومە کە هچ قومیك غزتەیکی نبی نە کس لە فکر و خیالی اوقومەو نە او لە انجام کار و باری خوی تی دە کا و او وقتە لە ناو قومان دنیا بی‌نام و نیشان دەمینیتەوە .

بناءً علیه بو سرفرازی ملت کردستان لە پیش همو شتیکا لازمە رغبت بم غزتەیە بدری .

چونکە غزتەیکی ملی و ترجمان افکار و خادم قوم کردانە .

مصرف چاپ کردن وسایرهٔ اول نسخهٔ ام غزتەیە لە طرف اعضایان دائمی جمعیت کردستانەوە تأمین کرا و ام اول نسخەیە تبرکاً و مجاناً توزیع و تقدیم برادران وطن دکری . فقط لبر امە کە حکومت پیشناً داوای مصرف چاپ کردنی ام غزتەیە اکات رجا و تمنی اکین کە حمیتمندان وطن هریکی آبونهٔ ۳ یا ٦ مانگی پیشیناً بنیرن و قید کردنی ناویان مراجعت بە محرر غزتە شیخ نوری افندی بفرمون .

امید اکین همو کرد زبانیك بە ناوی محبت وطن و زمانی خویەوە بە آبونە قید بی و بو کرینی ام غزتە ملی‌یە رغبت کاملە بنوینی .

علی کمال

.................

## مبارکبادی

بانگ کردستان نشانەی هوشیاری ملتە
بو اسر خوان معارف تذکرەی سر دعوتە
دورهٔ اقبالە دور بانگ کردستانمان
بانگ صبح صادقە بم دنگە هستین فرصتە
سایهٔ بال همایە باز زرین شاپرە
چونە زیر سایەی نشانەی بختیاری و دولتە
باغچەیکی پر گلە دریاچهٔ پر گوهرە
رنگ و دنگی فیض رزە نعمت بی منتە
بو ترقی قوم کردە داد خواە حالبە
ترجمان حال زار ملت کم قدرتە
بانگ کردستان لە خارا و حریر لایقترە
دك مبارك بی بە بالای قوم کرد ام خلعتە
آسمانیکە سراسر مطلع نجم وفا
گلستانیکە سراپا مظهر صد رحمتە
ام جریدە تازەیە جردەی جهانت لادبا
۳ زمان ۳ تیر دستە واسطەی صد نصرتە
ربی بومان هر ببینی خادم ملك و وطن
ام لە بو پیشکوتن امرو پشتیوان و قوتە
زیور

## اعلانە

او خانە کە لە بازار سلیمانی واقعە و بە خان سوراو مشهورە و بموجب قید طابو عند الاختصار و بهی عائد بە محمود پاشای جاف و معلوم الحدودە بە مقابل مارەیی زنی حبیبە خانم کچی علی بك حجز و فروشتنی قرار کرابوە و بو احالهٔ اولیە تا ۳۰ روز وضع بە مزایدهٔ علنیە کرا هرچە طالبە صدی دە تأمینات مستصحباً مراجعت بە دائرهٔ اجرای سلیمانی و منادی توفیق آغا بکات .

۲۷ تموز ۹۲۲ مأمور اجرا م : وهبی

[بانك كردستان] ك توركجه قسمى :

## كردستانك اسباب تدنيسى

هر درلو غرض و شائبه‌دن آزاده بر فكر و قناعتله قارئلرمزى محاكمه‌يه سوق ايديورز، كوردستانك اسباب تدنيسنى تدقيق ايده‌سونلر. عجبا بو طوپراغك يتشديرديكى انسانلرده خلقتك اهمال ايتديكى خواص نه‌در؟ ياخود حقيقى معناسيله تحصيل و تجربه كورمش وطنداشلرمز آره‌سنده ملل و اقوام سائره‌ده‌كى امثالندن علماً، عرفاناً، مزيتاً كرى قالمش اولانلرمز كيملردر؟ شبهه يوق كه هيچ. او حالده اسباب تدنيمزى همده انكارى مستحيل اولان تدنيمزى ايضاحه آراشديرمه‌ق بالطبع نظرمزه‌ك باشنده اوله‌رق معارف مسئله‌سى چارپه‌جقدر. اوت بو كون حالا قرون وسطائيلكدن چيقمامش اقوام وحشيه استثنا ايدلمك شرطيله ربع مسكونده معارف و صنايع نقطۀ نظرندن كرد ملتى قدر كرى قالمش هيچ بر ملت تصور ايديله‌مز. الك كوچوك و حتى هيئت اجتماعيۀ بشريه آره‌سنده تاريخاً الك دكرسز عد ايديلان اقوام قديمۀ وحشيه بيله بو كونكى كونده الك زنكين و الك اسكى بر تاريخ مدنيته مالك اولان اقوام عاليه ايله اوپوشورلركن يالكز طالعسز كرد ملتنك حالا تاريخيه قارشيسنده حكايات اساطيريه‌نك مسحور سيئاتى و بدايع فنيه حضورنده تعصب غير منطقيه‌نك دلسير ملهاتى اولمقده كوستردكى ثبات جداً شايان تأسفدر. بونلر نه قدر اغر اولورسه اولسون اعتراف ايده‌لم كه ملتمزك هنوز حد رشده وارمادیغنى اثبات ايدر. چونكه بر ملت رشيد اوله‌بيلمك ايچون عصر حاضرك احتياج مس ايتدرديكى افكار جديده ايله مجهز اولماليدر. حالبوكه او كبى افكار جديده خلقتك نوع بشره احسان ايتديكى دماغك خواص اصليه‌سندن دكلدر فقط دماغ بنيه و تشكلاتنك درجه‌سنه كوره خواص مذكوره‌يى تحصيل سايه‌سنده اكتسابه مستعددر ديمك ايسته‌رز كه تحصيلسز تفنن و فنون طبيعته دخول امكانى بولنمامش موادندر. فكرك تنويرى دماغك تربيه‌سنه و دماغك تربيه‌سى علوم حاضرۀ مكمله‌نك تحصيلنه وابسته‌در. تحصيلده بى نهايه اقسام و شعباته ايريلير. بوتون بونلرى بزه وعد ايدنده مكاتبدر. بر ملتك درجۀ معرفتى مملكتنده‌كى مكاتبك عددو نوعيله مقايسه اولنور. ايشته بونك ايچون جمعيتمزك اس الاساس غايه‌سى تعميم معارفله افناى جهالته خدمتدر و انشاالله بو غايه‌نك تأمين استحصالى يعنى كورد ملتنك حتى الامكان معارفجه اولان نواقصنك تلافيسى ايچون لازم كله‌جك فداكارلقده قصور ايدلميه‌جكى شبهه‌سزدر. بناءً عليه هر شيدن اول اغراض ومقاصد شخصيه‌دن بالتبرى خالصانه و وطنپرورانه بر شوق و آرزو ايله مقدس وطنمز ايچون چاليشمايى يكديكرمزه وعد ايتملى يزكه نشئه‌تمزك بزه وعد ايده‌جكى آتيدن مطمئن اوله‌بيله‌لم.



## خارجده بولونان كورد منورانه و افاضل كرامنه

(بانك كردستان) غزته‌سنك محترم الريكز آره‌سنده كزن شو ايلك نسخه‌سى اجرت طبعيه و مصارف قرطاسيه‌سى (جمعيت كردستان) طرفندن تأمين و تبرع ايدلمشدر؛ فقط هر كسجه معلومدر كه جمعيت نقدر فداكار اولورسه اولسون بر غزته‌يى اوزون مدت انتشار ايتديره‌بيلمك ايچون معاونت و همته محتاجدر. بز بو همتى بالخاصه سزدن ديله‌يورز. سوزمزى كوردلك اوغرنده چاليشمق، كوردستانك علماً ترقى و تعاليسنى كورمك ايستيان كورد حميتمندانه توجيه ايديورز. يالكز اجرت طبع و مصارف

قرطاسيه‌ني نظر اعتباره آلەرق بهر نسخه ايچون ٢ آنه
فيآت تقدير ايدلمشدر كه هيچ بر حميتلى كوردك كندى
وطنى ايچون هفته‌ده ايكى آنه ويرمكده تردد
كوسترميه‌جكى شبهه‌سزدر . كسبه يله حساب گورركن
محجوب اولوبده گرى آلاديغمز مليولرجه كوراني
دوشونەلم . هيچ شبهه يوقكه بكونى مهم مبالغلر تشكيل
ايدر . بادهوايه كيته‌جكى محقق اولان يكانه ملى
غزته‌مز ايچونده شو ايكى آنه‌جكى سوه سوه ويرەلم .
ويرەلمده بزده جمعيت بشريه‌نك كنديسندن خير
اومولور بر عضوى اولديغنى اثبات ايده‌لم ...

---

## معلومات تاريخيه

عوالم هجرت نبويه‌دن ١٨٣٩٦١ سنه اول خلق
اولونمشدر .

حضرت آدم بعض مورخلره كوره هجرتدن
٦٢١٦ سنه اول و فنيكه‌ليلره كوره‌ده ٣٠٤٧٩ سنه
اول خلق اولنمشدر .

طوفان نوح هجرتدن ٧٦٩ ؛ ياخود ٣٩٧٤ -
اول وقوعه كلمشدر .

حضرت موسى [ ع . م ] هجرتدن ٢٣٤٧ ياخود
٢٤٦٨ سنه اول دنيايه كلمشدر .

مصرده هجرتدن ٢٢٩١ سنه اول يدى سنه دوام
ايدن بر قحط و غلا ظهور ايتمشدر .

حضرت موسى عليه‌السلام هجرتدن ٢٢٦٧ ياخود
٢٣٨٨ سنه اول بنى اسرائيل ايله برابكده مصردن
چيقمش و تاريخ مذكورده فرعون و عسكرى نيلده
غرق اولمشلردر .

حضرت موسى [ ع . م ] هجرتدن ٢٢٢٧ ياخود
٢٣٤٨ سنه اول وفات ايتمشدر .

قسم فارسى [ بانگ كردستان ] :

## بانك كوردستان

( بانك كوردستان ) كه الحق ترجمان ملت است
خار چشم حاسد است و شاهراه رفعت است

كوردرا بيچاره خواندن نيكبينى كى شود
دردرا تشخيص بايد كرد كين يك علت است

ملتى را علم و عرفان راهبر كر بود زيست
ور نه اقبال از معارف دور باشد نكبت است

ميدهد نور معارف آدمى را پر و بال
فائقيت در جهان با علم و فن و صنعت است

رستم و آفراسياب امروز ناید چون به كار
زيستن را چاره تحصيل كمال و حكمت است

زر به خروار و غلامانش بودكر بيشمار
مرد جاهل زيرچنك عاقلان بيقدرت است

كوكب اقبال از افق وطن شد تا بدار
نو طلوع ( بانك كوردستان ) دليل رحمت است

اين علمراقوم ما برسر كشد البت رواست
مايه اش بر هر كه افتد باعث صد منت است

چكه عزم راه كرديم شما خوابيده ايد
اى رفيقان وطن بيدار كشتن فرصت است

رفيق حلمى

§

به تجارب متعدد و به تاريخ عالم ثابت است كه
كه به واسطهٔ ترقيات بشر ، تعالى ملت مربوطيت و
محبت معارف است : جاى انكار نيست كه هر قوم
متمدنى و هر ملت مترقى كه در كائنات موجوديترا
اثبات و در خريطهٔ عالم جاى بلندى را اشغال كرده‌اند
بى رهنماى معارف و بى مربوطيت علم خطوه انداز

ساحهٔ ترقیات نگشته اند . ملت بی معارف جسد بی روح را ماند . علم عامل مؤثر قوم است . معارف نتیجهٔ تکامل بشر است .

اگر تاریخ عالم را ملاحظه نمائیم می بینیم که ملل متعدده مانند عبرانی ، پونت ، هیتیت ، و امثال اینها سبب بدانکه متمایل معارف نبوده اند سوای اینکه خدمت بشریت را نکرده اند محافظه موجودیت وملیت خودشان تیز نتوانسته اند کرد . و بواسطهٔ انقلابات جزئی نام و نشانشان در صحیفهٔ عالم محو و کان لم یکن گشته . لیکن قوم فنیکه و آثور و کلدانی چون مربوط و متمایل معارف بوده اند . اگرچه بواسطهٔ مهاجمات متمادی شرق و غرب محو شده اند . باز بسبب اختراعات و کشفیات مهمه عالم بشریت را باخصوص عموم اوروپارا مدیون شکران خود کرده اند .

پس ما قوم کردان که اکنون درحالت ابتدائی هستیم و آثار تمدن و ترقیات اجداد خودمان مادو پهلویارا گم کرده ایم باید پیش از همه چیز مربوطیتی به معارف پیدا نمائیم .

چون حصول نعمت کمال بی زحمات گرسنگی محال است . سیرابی زلال بی وسیلهٔ تشنه ابی سراب خیال است هلال تا از خود تهی نگردید . به بدر کامل نرسید حباب دریکنفس تشنه‌گی استعداد دریاکشی‌هم میرساند آینه‌بانداك پروازی آسمانرا لقمه میکرد اند . ظرفها خالی قابلیت پرکردن است . بنابر این ماهم هرچند از نو معارف دور و محروم گشته ایم در علم و معرفت قابل ترقی داریم . نهال یکساله ثمری ندارد ولی چون مظهر خدمت شد عائله‌را به حالت رفاهی رساند . بناءً علیه نخستین تشبثی‌ما تزیدمعارف وتعلیم ابنای‌وطن است . تاکه از عصر حاضر که عصر ترقیات است بی بهره نشویم و خواهشمندم که حمیتمندان وطن منجز و اشراف مملکت در ترقیات معارف سعی وجهد کامل نمایند تا بی‌نام و نشان نشویم وازحالت ابتدائی خارج . وداخل زمرهٔ ملل‌مترقیه بشویم ودر خریطهٔ عالم وجودیتی ابراز و درکانت نمایشی اظهار نمائیم چون در علم و معارف اثبات موجودیتی نمودیم هیچ شبهه نیست که شمال و جنوب‌را به خود متمائل و بزبان محیط خودرا به زبان رسمی اعلان و نایل آمال مقدسه میکردیم .

سلیمانی : م . نوری

§

## بحضرت کوردهای محترم ایران

( بانگ کوردستان ) که‌ناشر افکار ملت کرد وخادم علم و معارف اسست دوام و ترقیش محتاج همت و معاونت همه وطن پروران کردستان است . چه‌در خصوص نوشتن‌مقالات‌ملی و وطنی و چه‌درخصوص آبونه شدن این غزته از غیرت منوران و متخیران کرد امید معاونت داریم .

در این خصوص کمترین سعی و جهد حمیتمندان وطن موجب شکران عظیم خواهد گردید .

بانگ کوردستان



دائر بتغلوبیت کردان در اطراف خوی در جرائد ایرانی چند سطری مطالعه شد مندرجات ان خرائد متخالف دیدیم و بنا بر مسموعات اخیرمان شایعات ایرانی باور نباید کرد برای مقاومت ایران اسماعیل خان ( سمکو ) قوای کافیه دارد تفصیلات در نسخهٔ آتیه درج خواهد شد .

---

له‌چاپخانهٔ حکومت له‌سلیمانی چاپ کرا

بانگ کردستان — صحیفه ۱

صاحب امتیاز و مدیر مسئول و سرمحرر
مصطفی پاشا

محرر کوردی و فارسی
علی کمال و م. نوری

اعلانات بدیریك
۳ آنه ده سیتریت
بو همو شتیك مراجعت
به صاحب امتیاز اکری

محرر تورکی
رفیق حلمی

بو داخل شهر و لوا بدل آبونه
۳ مانك دو ٦ مانك چوار
سالیکی ۸ روپیه‌یه
و خارج اجرت پوسطه
علاوه ده کری

# بانگ کردستان

( زمان گورزو رم رابوردو ایستا پالوان علمه )
( سلاح دسته صنعت بارقهٔ تیغ و سنان علمه )

علمی ، اجتماعی ، ادبی ، غزته‌یکی حر و سربست ملیه
هفتهٔ جاریك دردچی
اسخه‌یکی به ۲ آنه ده‌فروشری

سلیمانی
۲ آغستوس
۱۹۲۲

سال ۱ ژماره ۲ [ دوشمه ] ۲۰ ذی الحجه ۱۳٤۰ ۱٤ آغستوس ۱۹۲۲

نزدیکه مل کرته‌وه بومان چرای کرد
پرتو بدا همیشـه شعاع و ضیای کرد
ام بانك کرد و جمعیته بونی رحمته
مقصود سعی و خذمته بو اعتلای کرد
عالم حریکی معرفت و سعی به بو صعود
هرکس گیشته مرتبه بی ماسوای کرد
کی بی بکاته مقصدی ام قومه بیکسه
کی علم ابیته واسطهٔ و رهنمای کرد
کرد عنصریکی پاك و قدیم و مقدسه
عالم همو مقره به مدح و ثنای کرد
ای خالق زمین و زمان ما به مرحمت
لادی نفاق و بغض و حسد بو بقای کرد
حشـمت خیال وایه له پیناوی ملتا
دانی سر و بکا دل و جانی فدای کرد

سلیمانی : ( عبد القادر حشمت )

## ابن هیئت ناصحه له بغداده‌وه دیت

لم روزانه‌دا شایعه‌یك هیه داین هیئتیکی ناصحه له بغداده‌وه دیت بو کردستان .

۱ نزانین ام هیئته به امری کی دیت . به نسبت چه کسانی ریك خراوه .

۲ نازانین امانه که دین نصیحت چیمان ده کن .

۳ اگر مقصدیان امه‌بی نصیحتمان بکن تام عراق بین وحتی خوی لام باش نیه بیزراوه . و بکر کردایتی هتا بیت رك دادکوتی و ( بانگ کردستان ) له کل معارف بو ترقی و تنویر کردان سعی و کوشش دکات اجا ابی امه نازانین ام هیئت ناصحه یه دین جی داین

شعر

[ کرد اونده کردن به صد شیطان له کردی نکدون ]
[ ایکه خالق بوچی بوخوی دردسر پیدا دکا ]

آفرین بو ناظم ام بیته .

بانگ کردستان

## مسئلهٔ مکتب کردنه‌وه

لم دو ۳ روزانه‌دا ، ایره باسی کردنه‌وهٔ صنفیکی تر اکریت . وکو بیستومه باوکی طلبه‌کانی صنف یکم ثانوی

راضی بون بوه که مناله بی تجربه‌کانیان بنیرن بو بغداد لەوی بی صحب و بی تربیه بمێنه • کەامه ذلت و بذ ناوی‌یه‌کە بو کرد • بلی ، من مقصدم اوه نیه که اچن بو ناو عرب خرابه • امرو همو عالم اسلام دیناً تعب لسان عربه • بلام من الیم حیف و عیبه بو ملی کرد کەاونده نجیب و قدیمه و صاحب عزم و اعانه ایستا تابع بی به خلقی‌تر و خوی سر به خو مکتب و مدرسه‌یکی وای نەبی کەمناله‌کانی خویان تیا بخوینن و بین به پیاو • امرو ام ‌بانی کردنه‌وەی مکتبه عائده به همت و معنویات ملت • ابر اوه لازمه له سر همو کس که به جدی تماشا و تدقیق ام مسئله‌یه کا و زور تی‌کوشن بو کردنه‌وەی ام صنفه • ایمه که شش حوت طلبه‌ین له کرکوکه‌وه هاتوینه‌ته‌وه به اذن بو وطنه مقدسه‌کی خومان اتوانین لەسر ام تجربه‌ی یك ساله‌دا ایتر مجبین بو جیکایان دوریش و به همو اذیت و مرارتی تحصیل بکین • بلام تحصیل له بغداد و او جیکایانه بو اهل سلیمانی و ام ناوه زور زحمته و به قد نیوه‌ی تحصیل ایره استفاده‌ی نیه • چونکی لو جیکایانه هول قومیت ، دوم لسان ، سیم موقع جیاوازه ولیك ادریته‌وه ، ایمه کرد و کردستانین اوان تورك و عربن • زمانمان کوردی‌یه ، اوان تورکی و عربی‌یه ، ایمه شاخستانی و فیره هوای فینکین • اوان دشتی وفیره هوای زور کرم و بی آون • که وابو قط ری‌ناکه‌وی بو طلبه‌ی کرد که لو ناوه استفاده به تواوی بکات •

معلمه‌کانیان یا تورکه یا عربه له بر اوه ایمرو تماشای قومیت و جنسیت اکه‌ن به چاوی سوکی و خواری تماشای ایمه‌مانان اکه‌ن • لسانیان چونکه یاتورکی‌یه یا عربی‌یه و مناله تازه‌کانی کوردیش اختصاصیان لم‌زمانانه‌دا نیه ؛ له درس و تقریر درسه‌کان ناکه‌ن • مکر هروا بینوسنه‌وه و وکو طوطی لەبریکه‌ن که لەآخریشا هیچ استفاده ناکه‌ن و مسلکی فرنابن • ایمه که حوت کسین له کرکوکه‌وه هاتوینه‌ته‌وه ، چونکی م همو دردانه که عرضم کردن دیومانه و به سرمانا هاتوه هر له‌وی خیالمان کرد که هاتینه‌وه ولاتی خومان له کل همو رفیقه‌کانمانا که جد حزبه خویندن اکه‌ن تشبث بکین به مرحمت و معاونتی حکومت فخیمه و یاریه و اعانه‌ی هاو ولاتی • باوکو براکانی خومان • ام مضبطه‌و استدعایه کەنوسیومانه هربو اوه‌یه • انجا هرچی ارباب حمیت و انسانیت بی کمی کەوطن و ملتی خوی بنامی و حزبه سرکوتن و برز بونه‌وەی وطن و ملتی خوی بکاحزبه پیاوبون و انسان بونی اولادی خوی بکا اوا برام ایشه اقدمه به همو نوعی یاریه‌ان أدا • جا معلومه که کسی بو ایشیکی وا اقدس ، به دل و به کیان تی‌نه کوشی و حزی پی‌نکا لەنظر همو کسدا منفور ده‌بی •

لم مسئله یه‌دا کلی کس الکل امضا کردنا وعدی اعانه و یاریه‌یشی دا کەاو کسانه من به ناوی همو لایکمانه‌وه به دل تقدیر و تبجیل اکم • بعضیکیان وعدیان نەداوه بلام چونکی امضایان کردوه زور زور تشکر اوانه‌یش اکه‌ین • ایمرو کردنه‌وەی ام مکتبه هر بو ایمه نیه • بوهمو ملته بو همو براکانمانه کەوا لەژیر بار جهالتدا أتلینه‌وه • تکا له باوکو براکانی خومان اکم که مناله‌کانی خوتان مەنیرن بو ولاتان • امین بن بم کم تجربه‌یه‌وه چونه ولات اجنبی بو اولادتان خرابی و فلاکته‌لەوی یا له بر قومیت موقع و بی صاحبی تحصیل بی ناکری یا استفاده له دوس و معلمه‌کان ناکا • به ناهومیدی و دسته‌پاچه‌یی الەریته‌وه و بشکو بد اخلاق و سرکردان ابی و ناوی باوکو اجدادی خوی رەش اکاته‌وه • له بر اوه تکاتان لی اکەم که ایوه‌یش وا له مناله کانی خوتان مه‌که‌ن • مه‌بن‌به سببی محو یانبوچی خومان تی‌نه‌کوشین مکتبیکمان نەبی که ترقی بکه‌ین ؟ به ناوی استقبال و حیات براو هاو ولاتیه کانه‌وه به کام دل نیازتان لا اکم که تی کوشن بو کردنه‌وەی ام صنفه و یاریه‌مان بدەن تاکو هیچ‌نەبی اکمال تحصیل تالیه‌کەمان له ولاته‌کی خومانا بکه‌ین •

كه له دوايیدا خذمتی ولاته‌كه و هاو ولاتیه‌كانی خومانمان پی بكری . انجا او وخته چونكو هیچ نه‌بی نختی شاره‌زایی له زمانی تر پیدا دكین . اگر بچین بو جیكایانی دوریش نه‌ی ناكا . ایتر نختی هوشمان بیته‌وه به خومانا لم خوه زهرناكه خبرمان بیته‌وه .

خویندن قط بس نیه ، خصوصاً ایمه كه‌له معارف زور بجی ماوین نابی قانع ببین و دقیقه‌یك بی خویندن راببورین ! « اطلبوا العلم من المهد الی اللحد » به فرمودی پیغمبر ( صلعم ) . ایتر به‌دل تكاتان لی اكم له معاونت و یاریه‌مان موستن تی‌بكوشن بو ام مكتبه كه بكریته‌وه و اولاده‌كانی خوتان لم فرصت و نعمه بی بش مكن . اگر خومان هول بدین و تی‌بكوشین امینم كه حكومت فخیمه‌یش كه هر به خادم انسانیت و معارف نامراوه معاونت و مساعده‌مان افرموی « حی علی الفلاح » .

سلیمانی : زكی صائب

بو كردان

همت ارباب غیرت پیستون احیا دكا
او كسه‌ی صاحب حمیت بی وطن احیا دكا
یعنی اولاد وطن محتاج علم و صنعته
كر وطنپروری شخصی مكتبی انشا دكا
نورعلم ومعرفت وا شرق وغربی گرتوه
قوم ایمه تازه تعلیم خط و املا دكا
ایسته خو نوع بنی آدم له‌سایه‌ی فنه‌وه
بی محابا كشف ( اسرار یم بالا دكا )
بنیه فكر بی‌ثمر امرو كه عصر غیرته
ملك كردستان له ایمه همتی داوا دكا
چونكه‌هر ارباب علمه كربكا چاره‌ی مرض
كرد اگر عقلی بچی جیگه‌ی علوم آرا دكا
ایسته بی علم و هنر ژین بشر قابل نیه
چون له فن عصر حاضر كردی استغنا دكا
اوروپا كشف لسان استر و بارگیری كرد
تازه كردستان ایمه بحث الف و با دكا

رفیق حلمی

( بانگ كردستان ) له‌ماولا روژ دوشمه انتشار ده‌كا .

بغداد تایمس ٢ آغستوس ٩٢٢ جنرال هارینتین كه قوماندان همو قوای متحالفه‌یه له استانبولدا اعلانی كردوه‌ا كر له طرف یونانه‌وه تجاوزی بو پایتحت (استانبول) بی مقابله یونانیه‌كان دكا .

بغداد تایمس : ٣ آغستوس ٩٢٢ له تراكیاوه له طرف یونانه‌وه به استانبول هجوم متواتره .

خارجیه ناظر یونان له‌اتینه دا به صفرای دول حلفا تأمینات داوه كه هجوم واقع نابی .

بوتقویه‌ی قوای دول متحالفه ط بوری له جزیرهٔ مالطه‌وه بو استانبول ترتیب كراوه .

[بانك كردستان] ك توركچه قسمی :

صنایع و معارف

ملل مترقیه‌دن هرهانكیسنی كوز اوكنه كترسه‌ك كترهلم . كوره‌جكز كه معارف و صنایعجه همان همان عین درجه‌ده یوكسه‌لمك ایسته‌یه‌رك بوتون همت و حمیتلرینی بو ایكی امنیه نك استحصالی امرنده متوازیاً بذل جهد و غیرت كوسترمشلردر . مثلا بوكونه‌قدر بجرده صنایع ومعارفدن هانكیسنك دها زیاده متكامل اولدیغنی اكلامق ایسته‌ین بر سیاح هیچ شبهه یوقدر كه نه قدر درین تدقیقاته كیریشیرسه كیریشسین ینه او مملكتده بو ایكی شیدن هانكیسنك دیكرینه ترجیح ایدلمش اولدیغنی اثبات ایده‌جك دلائله شاهد اوله‌ماز . اسوچره‌لیلر دیكر مملك متمدنه‌ده اولدیغی كبی صنایع و معارفه عین درجه‌ده عطف اهمیت ایتدكلری ایچون بوكون مملكتلرینك هر كوشه‌سنده اوقدر متنوع مكاتب و مدارس موجوددر كه بورایه بوتون دنیانك بویوك بر مكتبی دینلسه بجادر .

عین زمانده بوتون بو مدارس ومكاتبك‌یانی باشلرنده بولونان لا یعد و لایحصی فابریقه و دارالصناعه‌لر دخی مملكتلرینی اودرجه اعمار وتزیین ایتمشدركه اورادده صنایع ومعارفدن هانكیسنك دها زیاده ایلریله دیكی . ملت و مملكتك ترقی و تعالیسی امرنده هانكیسنك دها بویوك بررول اوینادیغی ممكن دكل تقدیر ایدیله‌مز .

حال‌بوكه بونلردن بری و بالفرض معارف جهتی اهمال ایدلسه‌یدی صنایعك اسویجره‌ده تأمین ایتدیكی بوكونكی خوارق بالطبع وجود بولمایه‌جغی كبی بالعكس صنایعك اهالی تقدیرنده معارفدن‌ده الده ایدیله‌جك نتیجه ینه مقصده ناكافی كله‌جكدی . حاصلی صنایع و معارف بر انسانك ایكی قولی ، ایكی كوزی ویا ایكی قولاغی كبیدر . اعضای مذكوره‌دن برینك كوره‌جكی وظیفه ایكیسنك خدمت اصلیه‌لرینه نظراً نه ایسه معارف وصنایعدن برینك‌ده آیریجه كوره‌جكی خدمت عیناً اودر . بناءً علیه بزده ناصل دوشونه‌جكمزی بیلملم چونكه ابی دوشونلك هر ملتدن زیاده بزم وظیفه‌مزدر بزی بزدن ابی كیم دوشونه بیلر ؟ اوحالده كندی كندیمزی دوشونمك عزملك ایچون یوكسه‌لمه‌دیكمزی صوروشدقده معنا یوق . فقط دوشونمك ده كافی دكل كه . فداكارلق ، ثبات ، عزم و متانت ، ثروت بوتون بونلر اولمادقجه هیچده صارصلماز بر متانتله و هردرلو مشكلاتی اقتحام ایله مالاً و بدناً اعظمی فداكارلقلر اختیار اولونمادقجه زواللی مملكتمزده الی الابد الك اوفق بر دستكاه ، الك عادی بر ماكینه یوزی كورمیه‌جكمزه ، بدبخت وطنمزده نفخ صوره قدر آثار عمران و ترقی مشاهده ایده‌میه‌جكمزه امین اوله‌لم ...

§

### امرقی

ثروتده فضیلت آراق جهله نشاندر
جاهللرك انجامی ده البته یماندر
عقلك وار ایسه كسب فضیلتله بنام اول
كرچه فضلا شمدی ده منفور جهاندر
هر معركه ده غالب اولور فكر سیاسی
میدان سیاستده قلم سیف و سناندر
عزم ایله دیكلك ابشده متین اولمالیسك هم
رأیكده مصیب اولدیغكه خلق ایناندر
ارباب حمیت وطنی هر یره ترجیح
ایلر ، نظرنده وطنی باغ جناندر
افكاری سقیم اولماسه اشخاص لئیمك
اغیاره اولان خدمتی محتاج بیاندر
بیلمم نه تحف دورده بز شمدی الهی
عاقل او ایمش كه بوتون افكاری نهاندر
بر تفرقه هر فرقه‌یی ایتمكده پریشان
البته كه سودی وطنك بونده زیاندر
ظنمجه بنم رفع جهالت بو وطندن
محتاج ید قاهر تأدیب زماندر



---

قسم فارسی [ بانگ کردستان ] :

ایران ۳ ذی القعده ۱۳٤۰ : راپورت تلگراف خوی مشعر است که بر حسب اخبار واصله صبح ٥ سرطان : ۲٦ جون ۹۲۲ لشکر اکراد به قریهٔ رهل هجوم آورده جنك سختی شده بالاخره اکراد شکست خورده چند نفر از ایشان مقتول و مجروح شده است علی نقی خان یاور فوج نهم خوی و دو نفر سرباز زخمدار هستند .

ایران ۷ ذی القعده : بنا بر راپورت واصله در هفتم سرطان قوای خوی با اشرار اطراف آنجا زدو خوردی نموده موفقیت با قوای دولتی بوده .

ایران ۹ ذی القعده : بموجب خبر تلگرافی که از آذربایجان رسیده اخیراً در اطراف خوی تصادمی با اکراد به وقوع پیوسته که در نتیجه ۲۸ نفر از اکراد به شرح ذیل مقتول گردیده .

ارمنی ۲ نفر . عسکر ٦ نفر . کرد ۲۰ نفر .
۲۸ رأس اسب و محمد آغا نام که از بهادران اسماعیل آقا
و رئیس همین ٦۰۰ نفر سوار بوده به قتل رسیده است
ضایعات عبارت از ۸ نفر مجروح است .

**طهران : ایرانه**

**بانگ کردستان :**

به این حوادث اعتنای چندان ندارد درین زمانه
بودن ارمنی در میان لشکر کرد مستبعد است ونامهٔ
بومبائی یعنی نارنجکی که به حیله و به دنائت در تاریخ
۳۳۷ شعبان هجری از طرف حکومت ایران به
( چاری ) برای اسماعیلخان فرستاده بودند به اتفاق
ایرانیان با ارامنهٔ روان شده بود .

دیگر کردان شکاك با ارامنه چه طور و به چه
شرطی اتفاق کرده اند .

این از ما مجهول است . و مقصد از عسکر چیست
اینهم خیال است .

مسئلهٔ بومبا ( نارنجك ) که باعث ان اختلافات
و نزاع خونین در بین کردان و عجم بروز کرده و
اکنون باکمال شدت دوام میکند این طور است :

اولاً اسماعیل خان پسر محمد پاشا پسر علی خان
پسر اسماعیل خان رئیس شکاك است اباعنجد این خانه
من القدیم سرداری اکثر عشایر کردان شمالی کرده اند
عشیرت شکاك تماماً در خاك ایران یعنی در بین خوی
و اورمیه و قسماً در داخل ولایت وان و حکاری
میباشند رئیس کل هردو قسم پدر و اجداد اسماعیلخان
بوده جد بزرگشان که اسماعیل خان است به حیله و به
تأمینات و سوگند خوردن حکومت اورمیه و تبریز
برای قبول کردن جامت و سنانره به طرف اورمیه
دعوت شده اورا به قتل رسانیده اند پس از مدتی دیدند
که پسرش مرحوم علی خان شکاك در آن حوالی شهرت
و نفوذ زیاد پیدا کرد .

ایرانیان باز این مرد دلیررا به انواع تأمینات
دعوت کرد و خلاف وعد و قول به تبریز فرستاده و
در محبس آنجا زنجیربند کرده و به قتل رسانیده اند
پس از مدتی مدید پسران مرحوم علی خان که محمد آغا
و تیمور آغا نام بوده اند نیز تفوق و اشتهار پیدا کردند
و برای تخلیص کردان از مظالم ایران سعی و کوشش
زیاد نمودند چون ایرانیان ترقی این عشایر شکاك را
دیدند و آشکارا برای گرفتن و محو کردن اینها مقتدر
نبودند درمیان دو برادران فساد و اختلاف انداختند
این دو برادر را از یکدیگر جدا کردند محمد اغا که از
حیل و دسایس ایرانیان اصلا امین نبود در تاریخ ۳۰۹
رومی با جماعت خودش در بین چاری که(قدیماً مقر
ادارهٔ رؤسای شکاك است وآن حوالی در پاداش
صداقت و بهادری یی که در جنگ سلطان سلیم خان با
شاه اسماعیل صفوی در عال خوی ابراز کرده بودند
از طرف دولت عثمانی با فرمان به ایشان داده شد)
و سلماس قریب حدود عثمانی تمکن کرده و با ایرانیان
مشغول جنك شده دولت علیهٔ عثمانی محمد اغا را به
توسط شهبندری در خوی که ان وقت ارکان حرب
بیکباشی مصطفی بك بود عثمانی امنیت داده و در ناحیهٔ
الباق که مضاف باش قلعه است اسکان کرده و به لقب
پاشایی و ماهیه به هزار غروش معاش تلطیف کرده بود
پس از مدتی سبب به کار ندانی مأموران انوقت عثمانی
و اغفالات معلومهٔ ایرانی محمد اغا باز به طرف چاری
مجبور عودت شد و انجا طرفدار بسیار پیدا کرد و
اهمیت به ایرانیان نمیداد درتاریخ ۳۱۲ رومی چون
ناصرالدین شاه شهید شده و ولی عهد مظفرالدین شاه
از تبریز به رفتن طهران مخافت داشته بود بواسطه
مراجعت به محمد اغای شکاك کرده او هم پسرخودرا
که جوهر اغا نام بود با ٦۰۰ سوارهٔ چالاك شکاك به
رفاقت مظفرالدین شاه مرحوم تا طهران فرستاده و
از شاه خیلی رضامندی دیده بود . مأموران اذربایجان
از اینحالات متأثرشده و درحق شکاکان حسد زیادپیدا
کردند ولی چون به طرز معقول و حقانیت نتوانستند
به شکاکیها ظفر برند . بانواع دسایس جوهر آغارا
به نام یك مأموریت بزرك به تبریزدعوت کرده در سنی
خوردن طعام اغای مشار الیه را باچند خویشان خودش

به قتل رسانیدند . یکی از انها میرزو نام که خالوی جوهر آغا بود خنجر کشیده درمیان این زد و خورد خود شرا خلاص کرده و درمیان بازار تبریز هر کسی را تصادف نمود به خنجر اتلاف و قتل کرده نهایت در کنار شهر یك اسپ لخت بدست اورده و به طرف خوی و چاری توجه یا عودت شده بود که این ذات بهادر اکنون زنده و نزد اسماعیل خان ( سمکو ) موجود است .

محمد پاشای شکاك از قتل پسرش که حقیقت رسم زمانه خود بود متأثر شده ایران را ترك و به استانبول و به استانهٔ سلطان عثمانی ( جنتمکان سطان عبد الحمید خان ) التجا کرده . انجا هم سفارت ایران از تشویقات و تحریکات غافل نبود تاوقتی که قتل شهر امینی استانبول رضوان پاشا رو داد و طایفه بدر خانی که ساکن استانبول بودند باین قتل متهم شده بودند از انها چند نفری را به خارج نفی کردند . سفارت ایران برای استفاده ازین وقعه محمد پاشای شکاك را ظاهراً از روی دوستی به سفارت دعوت کرده بودند و لی زیر والی که ازطرف بد خواهان برعلیه محمد پاشا به سرای همایون تقدیم شده بود خفیاً سفارت ایران تقویت کردند تا اورا به جزیرهٔ رادوس نفی نمودند . وانجا وفات کرد . پسران پاشای مرحوم و معتبران شکاك درحق ایرانیان روز به روز عداوات و عدم امنیتشان زیاد شد تا وقتی که این اسماعیل اغا اثبات رشد کرده و ریاست شکاك را به دست آورد تسلط به اطراف اورمیه و خوی ملحقات نمود انجا اشتهار و تمکن زیاد پیدا کرد ایرانیان به طرزیکه عادت قدیمهٔ خودشان بود ظاهرا با اسماعیل اغا رفتار دوستی آغاز کرده و هر چیزی که او طلب میکرد ترویج می نمودند و لی خفیناً برای کسر نفوذ او و حتی برای محو و افنای وجود او و معتبران سایرهٔ شکاك از دسایس غافل نبودند وقتی که فاجعهٔ حرب عمومی ظاهر شد ( این مسئله خیلی دراز است به صرفنظر مجبور شدیم ) و اسماعیل اغا از حکومت اورمیه وخوی درحق کردان اذیتها و مظالم زیاد میدیدا وهم ؛ این کارها به قوت و شجاعت خودش با مأموران ایرانی از جنك و جدال غافل نبود و قسمی زیاد از اطراف اورمیه و سلماس را داخل نفوذ خود کرد ایرانیان هر چند به اسماعیل خان لقب ( سردار نصرت ) واوند و ظاهر او باخصوص تحریرا از اظهار و ابراز دوستی رو نمی پیچیدند ولی برای اتلاف اسماعیل خان و پریشان نمودن شکاك روز به روز جهد عظیم میکردند تا تأریخ شعبان ۳۳۷ هجری از طرف محمد علی شاه زاده ولیعهد ( تبریزی عبد الملك زاده مکرم الملك ) محمد حسن میرزا پنجا و چهار هزار تومان به واسطهٔ پیشکار خودش به قومیتهٔ ارامنهٔ روانه فرستاده که به قوت صنعت و مهارت قومیته کی برای اتلاف اسماعیل خان یك ترتیبی فراهم اورند . مابعد دارد

---

اخبار هندو مورخه ؛ جولائی ۹۲۲ ز مدرس ( هندوستان ) می نویسد که جناب الاکرم حضرت حاجی سلام محمد از اهالی بمبی ( هندوستان ) مبلغ ..  ملیون روپیه برای افتتاح یکی ایتام خانهٔ مسلمین .. شهر سورت ( هندوستان ) اعطا نموده است .

---

## اعلان

۹۲۲ --- ۵۸

حصص معلومهٔ شیخ قادر مفتی لو اراضی نه که له دی اسطیل واقعه هرچند له نتیجهٔ مزایدهٔ علنیه .. به [ ۱۸۵۰ ] روپیه لسر طالبی تقرر کردوه چونکه ام مقداره له قیمت حقیقیه‌ی به درجهٔ فاحش نقصانه بموجب مادهٔ [ ۱۰۸ ] قانون اجرا تا یك مانك تکررا وضع مزایدهٔ علنیه کرا هرچه طالبه صدی ..تأمینات مستصحباً مراجعت به دائرهٔ اجرای سلیمانی و منادی توفیق آغا بکات .

۳ آغستوس ۹۲۲ مأمور اجرا : م . وهبی

له چاپخانهٔ حکومت له سلیمانی چاپ کرا

صاحب امتيازومديرمسئول وسرمحرر
مصطفى پاشا

محرر كوردى و فارسى
على كمال و م . نورى

اعلانات بدريك
٣ آنه ده سينريت
بو همو شتيك مراجعت
به صاحب امتياز اكرى

محرر توركى
رفيق حلمى

ده دانه ژ شهر ولوابدل آبونه
٣ مانك ده ٦ مانك چوار
سالكى ٨ روپيه يه

بوخارج اجرت پوسطه
علاوه ده كرى



(زمان گوزرو وم رابوردو ايستا پالوان علمه)
(سلاح دسته صنعت بارقهٔ تيغ و سنان علمه)

سليمانى
٢ آغستوس
١٩٢٢

علمى ، اجتماعى ، ادبى ، فنتهيكى حر و سربست مليه
هفتهٔ جاريك دردچى

نسخه يكى به ٢ آنه ده فروشرى

سال ١ ژمارهٔ ٣ [ دوشمه ] ٢٧ ذى الحجه ١٣٤٠ ٢١ آغستوس ١٩٢٢

## حسب حال دوم

اى ناس ، اى برادرانى كردانم ، له اول نسخهٔ بانگك كردستاندا له پاش سلام به بعضى قسه بو انتباهتان جسارتم كردبو وام دزانى كه له او قسانه ، كه له او رموزانه انتباهيكتان بو حاصل بوه وا اسف هيچ تأثيرى پيدا نبوه حرص جاه و حسودى ، سعى و كوششى تنها بو منفعت ذاتى هر دوام دكا . آيا محبت ى و وطنى وا دبى ؟ له پاش خوتان بو اولاد و احفادتان تذكاريكى چاك بهجى بينن ، لهپاش مردنتان فرزندان وطن رحمتيكتان بوبنيرن ، بهسر قبرهكانتاندا به اسپايى و به سلام و تعظيم پى هلبنين اولادهكانتان به عز و كردار ايوه خوشحال و خوبرزى بنوينن اوانيش هر مال و مال نكرين ، هر به توتن كيشان و به نوشين چاى خاون مردو مشغول نبن فكر تحصيل علم بكن . دنيا نى بگن تا له مجالس مدنيتدا اثبات موجوديت ومدنيت وبه سربستى اظهار افكار ومنويات بكن تا كى بو چاكى و ترقى وطن دنگك نكرى ، هر بحث تيره وكليره ، هر قصهٔ توتن و تتيره بكرى . هر دفتر خصومت جهالت پشومان بخوينرى بم اخلاق مذمومهيه بوچى ( عفى الله عما سلف ) نبيزرى . كرى مأموريتيكى بى هركس چيوى ظالميكى به دستهوهبى درحق هم وطنان خوى دبى به فرعونى . به اضرار غير خوشحالى دكا . به فلاكت زدهبى له جياتى معاونت مضرت اكهيتى . دور ورنهكانى دهدن كه به قيمتيكى مفت چىيان هيه له دستيان دربينن لهكل ام حال و حركاته اكر له مجلسيكدا يا به يكى لوت خوراو ، پارچه افنديكى پوتين دراو ياخود كلاره به سريكى درهاتك هل كراو به بينن هرچى حقيقته دى پوشن هرچى لهدم اوانه دردچى به اوه ( نم ياسيدى ) ( آوت افندم ) ( بلى قربان صاحب ) زور چاكه ارى ، والله هر وايه . دلين و وظيفهٔ انسانيت و وطن پرورى بم رنكه بهجى دبنين فقطلم حاله هروكو خدا راضى نابى ، نه انكليس

حفظ دكا ، نه ابليس به دل تصديق دكا .

له قديم دمان بيست كردان زور مسلمان و راست كون ، من ايستا دبينم هرچند به ظاهرى خدا شكر اسلامتى ماوه فقط به درو والله و بالله باوه . له ناوماندا جسارت مدنيه مفقوده . مدلول ( النجاة فى الصدق ) زور كم عمل پى كراوه .

درحق به يك حزمايه تى ، دراوسايه تى له عمل كوتوه له مجلساندا بو افتتاح غيبت . مثلا : اسپى كابرا خوش بزه ، تانجى يارو زور كره دهلين و غيبت و حكايت دس پى ده كرى اى برادران وطن . فكرى احوالى خوتان كن صرفنظر له اقوام عظيمة متمدنه وك انكليس المان . موسقوف . فرانسز . امريقا . ژاپون و سائره ايوه هرقوم ارمنى و ملت موسوى ملاحظه بفرمون له زوروى دا به نسبت قوم پهلوى خومانه وه هرچند شش يك و ده يكيش ناين فقط له نظر معارف و صنايعه وه وك كرده كروى و كوه البرز فرقمان هيه . هيچ ارمنى يكى قالكوته يى نيه كه احوال ارمنى استامبول نزانى . هيچ ارمنى يكى وانى نيه كه له افكار و تشبثات ارمنى يانى امريقا خبردار نبى . هيچ مندال ارمنى يك نيه كه همو غزته ارمنى حتى او غزته كه له امريقايشه وه دى نخوينيته وه له نفس استامبولدا به زبان ارمنى غير از رساله و كتيب پينج شش له جيكايان تر متعدد غزته يان درده چى ژن و پياو حسب الحميه همو دى كرن و دى خوينن و بم نوعه مغرب و مشرق له يكتر خبردار دهبن . له استامبولدا مكاتب منتظمه . معلمان متفننه يان مريضخانة مخصوص مكليان هيه . له حكما . له جواهرچى . له تجار كوره له اجزاچى . له طبيب حتى له محرر و ادبا و سائره قسميكى زوور همو هر ارمنى يه . اكل يك به رحم و به شفقتن مثلا له اناطولى دا له تنها دا ارمنى يك بكوژرى له پايتخت المان دا له پيش چاوى عالم به ضربة دمانچه حق ده سينى موسوى يك له مسقواوه هجرت بكا جمعيت صيونيزم بو استراحت او مهاجره غريبه نتاسراوه بس هرچى لازم بى له فلسطيندا بچى اهينرى . بو تحصيل مندالان له طرف روميكى دوله منددى به غيرته وه مكتبيكى چهل هزار ليره يى له استامبول دا بنا دكرى بچكى ١٥٢٤ غزته يكى هفته يى مختصرمان پى اداره ناكرى . ازين بكذر حتى له نان خواردنيشدا راحتى مان نيه له هيچ ماليكدا اوطه يكى مخصوص بو طعام نيه . بو كشيدة شيرين بستراو بو سرپوش به پوالكه چنراو بو كواى به قيمتى اوطو ندراو بو كلاو آلطونى نازك ريكخراو نه دولاب مخصوص و نه جيكايكى مشخصى هيه . له كل ادعاى تعصب اسلاميتمان دتوانم بليم له هيچ ماليكدا غسلخانه يكى پاكى حاضر به دستى تيا نيه . والحاصل له همو چشتا بى سليقه ين . هر پلاو و باميه . هر پلاو و باميه .

احوال حامكانمان له كل ام آوه زورانه يان هيه منظره يان موجب اسف عظيمه . صرفنظر له طاقم حمام له فوته و پشتمال ، له مندر و بابوج قاب قاب عاديشى تيا نيه به پى پى خاوس بهسر همو جركاب تلو حامدا درون له قدم خانه يش در دهچن به او حاوه و به دومان وجودمانه وه رو بو حزينة آو كرم دكن ، كريش سر ، عرق بن باخل و سائره و سائره لو حزينه كرد دبيته وه يك له دوى يك به او آوه كرمه خاصيت كورر اوه غرغره و غسل ده كن عجبا علماى كرام بو امه چى دفرمون صاحب حامه كان تاكى بم حاله راضى دهبن . اى باوكى باوكم ( النظافة من الايمان ) فرمووراوه معناى نظافتيش به تحصيل علم و فنون معلوم ابى له نسخة پيشوى ( بانك كردستان ) عبرت بزانن تجاريكى هندستانى [ بومبايى ] چوار مليون روپيه ى بو ايتامخانه يكى مسلمين كه مندالان يكى تيدا اه خوينن هديه كردوه . له كردستاندا له وقت رستم زاله وه هتا وقتى دوام زورخانة ( خواده كل ) چه پهلوانيكى به غيرتمان ام همته ى كردوه .

ماويه تى

مصطفى پاشا

بانك كردستانه وا دنیای احیا كردوه
زام قلب كرد بیچارهٔ مداوا كردوه

باعث پیشكوتنی ام قومه یه او مطبعه
الحق امرو خاك كردستان زیبا كردوه

صدشكر وا لشكری عرفانو علم و عاقلی
شاو پر شور جهالتیان كه یغما كردوه

لایق تحسین و فخر قوم كرده چونكه وا
امجریده پیر و فرتوتیشی برنا كردوه

بانكو داواریكی برزه بانك كردستان دكا
میشك دنیای پرلدنكو شوروغوغا كردوه

ژنكو تاریكی جهالت وا لدلدادودكات
قلب محزون همو كردی مصفا كردوه

لاچووه تاریكی هوری جهالت ایسته كه
نجم اقبال همو كردان رخشا كردوه

قائممقام البجه : احمد مختار

## به خیرهاتن

شاعر شهیر كرد مفتی زاده جناب محمود بیخود افندی كه مدتیك بو له كركوك اقامتی كردبو هفتهٔ پیشو تشریفی هاتوه‌ته وه بو سلیمانی به خیرهاتنی اكین .

بانك كردستان

---

## ماكینهٔ چاپ

ماكینهٔ چاپ یكیكه له نشانهٔ ترقیات ملت . قومی ملتی كه واسطه‌یكی انتشار فكر و افهام مرامی نبی اوفكره او غایه یه بی اوه‌ی بكاته كویك یا كوی كریك بی تأثیر و عقیم امینیته وه بلام هر ملتی صاحب مطبعه مالك غزته‌یكی ملی خوی بی بو ترقی و تعالی ملته كی هر غایه و املیك تعقیب بكا اتوانی به دنكیكی برز و بلند بی كیفیته كوی او كسانهٔ كه كوی كر و خادم معارف و ملتن .

امجا له پیش همو شتیكا لازمه كه شتیك واسطهٔ ام القاآته‌ بی به هوایكی زور پیدای بكین امه‌ش ماكینهٔ چاپه ماكینهٔ چاپ بو همو آمالیكی ملی اجتماعی اقتصادی چاردریكی داخلی وخارجی بعو بو توحید افكار وحسیات قوم عامل و واسطه‌یكی زور مؤثره . جكه لمانه‌ش آثار و ادبیات او قومهٔ پی له چاپ ادری كه امه‌یش حافظ علم و ادبیات اوقومه‌یه او ملته اگر خوبشی منقرض بی آثاره‌كهٔ باقی ابی و تا دنیا بمینی ناوی امینی لوآثاره نسخه یكی بفوتی هزاری امینی . بلام آثار یكی نفسی كه ثمرهٔ سعی و محصول حیات عالم و یا شاعریكی به قیمته لبراوه كه هر نسخه یك یا دوی به دستخطیكی ناخوش نوسراوه‌ته وه له مدتیكی زور كمدا افوتی و له ناو ده‌چی او آثاره به كلی آثاری ون ابی سعی و جهدی او ذاتانه بی نتیجه امینیته وه .

معلوم همو كسیكه كه له هشتمین عصر میلادی دا یعنی له پیش ایجاد مطبعه دا ام عالمه لسر « پاپیروس » كاغذ و « پارشومن » یعنی پیست اویان نوسی . كاغذ لبرامه مقاومتی زور نبو مجبور بون له سر چرم آثاریان اه‌نوسی لبرامه چرم رغبتی پیدا كرد و زور كران بو . او كتیبانه كه لو وقته دا هبو هموی به دست نوسرابوه وه و بو نوسینهٔ ودی زوری پی اه‌چو . بم احواله كتیب كم هینرایه وجود و اوانه‌ی كه انوسرانه وه زور كران بون حتی او كتیبانه كه به دقت انوسرایه وه به چوارصد پینجصد فرانق افروشرا لبرام جهته ام كتیبانه به دولمند نبوایه به كسی تر ندكرا ولو زمانه‌دا هر دولمندكان خوینده‌وار بون .

بو اوه‌ی آثار علما تازه‌كانیان بنوسن و استفادهٔ لی بكن مجبور ابون او آثاره نفیسانه‌ی قدیمیان كه له سر چرم نوسیبویان ایان كراند و له سر اوه ایان نوسی له چوارده همین عصردا كه دارالفنونه‌كان احداث كران بو پیدا كردنی كتیب زور محتاج بون لو وقته‌دا ( له سر تخته حك كردن ) داهات یعنی كتیبه‌كانیان

لە سەر او تختەیە حك اكرد بلام لە ١٥ همین عصری میلادی‌دا كە لە طرف كوتنبرغەوە مطبعە ایجاد كرا لە المانیایا هیچی آثاری قدیم و تازەیان هبو و هموبان چاپ كرد و بم نوعە فقیر و دولمند ممكنیان بو تحصیل بكرن و بی‌خویننەوە .

كە مطبعە بلاو بوەوە بە ایتالیا و سایر حكومتەكان‌دا اوانیش او آثارانەی كە مەبوبان تیان هیشت بفوتی و هموبان چاپ كرد . و بە همو منطقەیكی خوبانا بو اوەی استفادە لی بكن بلاویان كردەوە .

اینجا بو اوە ایمەیش ام آثارە نفیسانە و ام ادبیاتە بە قیمتانەمان لە كیس نچی و بە مرور زمان نە فوتی لازمە لە طرف غیرتمندان محترم وطنەوە بو هینان و و كرینی ماكنەیكی چاپ قصور نكری لە حمیتمندان اهالی محترمۀ كردستان وا امید دەكم بناوی منفعت ملتەوە همت بو هینانی ام ماكنەیە بكری . امەیش تكلیفیكی اوندە گران نیە كە لە هموكس هل نەی . بندە بو ام ایشە خیرە دلالت و تشبث اكم هر كس بە قدر اقتدار و همتی خوی معاونت بفرمون بناوی ملیت و كردیتەوە استرحام اكم .

سلیمانی : م . نوری

## المانەكان معاونت كالیەكان دكا

وا پوری لەمانك تموزدا كە لە لیانی ( كوكسافن ) حركت كردوە بە قدر تجهیزاتی سی ٣٠ طیارەی پی بوە و بو جیكایكی مجهول حركت كردوە بعضیك دەلین بو ( مرسین ) و بعضیكیش بو ( پتروغراد ) رونشتنی بیان دەكن و اغلب احتمال لە بحر غرب اوروپاوە بەتیپربونی احتمال ادری .

## تركیا و یونان

بو مذاكرۀ صلح و یونان دول حلفا اشتراك ناكا و هر مرخصی ترك و یونان لەژیر نظارت دول حلفادا لە استانبولدا بو اجتماعیان بیان رأی كراوە .

١ ــ اجتماعە لە نزدیك بە استانبولەوە لە ( بیقوز ) كە داخل اذمیدە عقد بكری .

٢ ــ منع پاپورانی یونان لە خصوص بومباردومان صامسون و مرور قاچقچیتی ترك .

٣ ــ بە كورەی شرطیك كە لە پیشدا تقرر دكا لە وقت معیندا لە پارس عقد مجلس صلح بكری .

٤ ــ اگر فضائح تازە لە اناطولیدا وقوعی تحقق بكا تضمینات تازە داوا كردن ( بو حمایۀ اقلیات ) .

## مصر اعانۀ فلاكت زدەكان اناطولی دكا

همو علمای مصر فتوایان داوا كە جژن قربان او قربانیانە كە سر دەبرن پیستەكانی بفروشن بدلیان بنیرن بو فلاكت زدەكانی اناطولی .

بە كورەی غزتەكانی مصر بەلای ئەوە قیمتی ام پیستانە ( ٣٠ ) هزار لیرا دەكا .

## وفات

امیر تونس محمد الناصر كە پیاویكی زور بدین و بە غیرت بوە لم روژانەدا وفاتی كردوە رحمت خدای لی بی .

لە جیكای او آموزای خوی صاحب الجلالە محمد الحبیب دانیشتوە خدا لی مبارك بكا .

امیدمان هیە امیش وك امیر مرحوم لە او غری وطن و ملت خوی سعی بكا و امیر اجانب نی .

## گرما

حرارت ام هاوینە بە شدت بو شوان میشولە زور بو و ایستایش وایە ژنیك و منداليك لە شدت گرمادا كنار شار مردو ون لە پیاوە قدیمەكانمان بیستوە لە ام اوپیش لە مدۀ كلی سالەوە گرمای وا نەبیزراوە

له كركوك و موصل درجهٔ حرارت له سيبردا گيشتوه به ٤٣ — ٤٤ درجهٔ سانتيغراد و چند كسيك له او شارانه‌دا و له صلاحيه‌يشدا له گرمانا مردوه .

تبشير بو قلياندواران

امسال له لواى سليمانيدا توتون داين زور به بركته وك توتون زور به بركته همو نوعه ميوه‌يكيش ماشاالله زور هرزانه .

له‌سينه‌وه هتا تبريز له‌منطقهٔ غربى ايراندا آسوده‌ى نى‌يه ام منطقه‌يش همو هر كرده بزانين جناب اسماعيل خان چون اصلاحى دكا له حكومتى ايران هيچ امايك نى‌يه خدا بو كردانى چاك بكا .

∴

انتخابات

بو انتخابات تازه سليمانى حقيقت حكومت حسن نيتى اظهار و بو اميش به هولايك امر عدالتى‌دا فقط له بعضى جيكادا باخصوص اوانه‌ى كه وظيفه‌دارنه‌بون زور بى اصوليان كرد و اهالى قسم اعظمى له امه مغبر بون البت حكومت تحقيقاتى امه اجرا افرموى .

[بانك كردستان] ك توركجه قسمى :

تشريف

سيادتمآب شيخ عبدالقادر افندى حضرتلرى بغداددن عودتلرنده ملكلرى اولان داريكلى قريه‌سنه مواصلت بيورمش اولدقلرى مع المسار استخبار ايدلمشدر . مشار اليه عرصهٔ خوش آمدى ايلرز .    بانك كردستان

تعيين

سنين مديده دنبرى مملكتمزده ايفاى حسن خدمتله عفت و استقامتنى هر كسه طاتمش اولان مرحوم مجرم افندى زاده — شاكر افندى بوكره نحو يلاء البحه تلغراف مديريتنه تعيين بيوريله رق محل مأموريتنه عزيمت ايتمشدر موفقيتلرينى ديلرز .

بانك كردستان

وليمه

كركوك خاندانندن عزت پاشا حضرتلرينك كريمهٔ عفت وسيمه‌لرى خانم افندى‌ايله بغداد خاندانندن گيلانى زاده سيد حيدر افندى حضرتلرينك گچن هفته كركوكده امر مسنونك عقدلرى اجرا قلندينى تجمه غزته‌سنده اوقوندى جناب حق متيمن و مسعود ايلسون آمين .

قسم فارسىٔ [ بانك كردستان ] :

استقبال و خوش آمدى بانك كردستان

اى غنچهٔ شكفتهٔ بستان خوش آمدى
اى بلبل انيس گلستان خوش آمدى

صبح سعادت از لى وا خبر دهى
اى مبتداى جملهٔ عرفان خوش آمدى

صد چشم تيره از قدمت يافت روشنى
بوى قميصى يوسف كنعان خوش آمدى

اى بانك كرد و ناشر افكار عالى
وى باعث تعالى كردان خوش آمدى

لب تشنه در سراب جهالت بمرد كرد
اى قطره‌هاى رحمت باران خوش آمدى

اى ترجمان غايه واى ناشر امل
وى مايهٔ ترقى و عمران خوش آمدى

اى حسيات ملت و اقوام را خطيب
وى ناصح سعادت وعرفان خوش آمدى

سليمانى : م نورى

∴

### مابعد است

ان ارمنیان یك صندوقچهٔ خیلی مصنع مانند صندوق شیرینی درست کردند که درمیان ان صندوق ( قارنجك ) یعنی بومبای مدهش ترتیب شده بود ان صندوق به واسطهٔ حاکم خوی ( ثقته السلطان ) برای اسماعیل خان فرستاده شد شخص عیاری که این صندوق بومبارا حامل بود به طرف سلماس به قریهٔ کانیان امده درانجا ازاهالی قریهٔ کوره سین یك کردسنی ساده دلی پیدا نمود باو گفت که من ناخوش هستم این صندوق هدیهرا از تبریز اسماعیل خان طلب کرده هرکس باو برساند نزد اسماعیل خان خیلی مقرب خواهد شد و من هم پس از یکدو روز دیگر که خوب شدم به چاری میروم چند تومانی بخشیش به شما میدهم به سلامتی این صندوق‌را به آغا برسانید و جواب برایم بیارید .

این کرد ساده دل به این حیله باور کرده صندوق‌را با کمال صفوت پیش اسماعیل خان برده . و واقعه‌را عرض نموده . آن ساعت اسماعیل خان با برادرش و جمعی از اقارب و اتباعش در مجلس نشسته بودند این صندوق‌را دیدند که کلید ندارد خواستند که به بعضی آلات و ادوات صندوق‌را واز بکنند اسماعیل خان از شکل صندوق شبهه کرد و به آدمانش گفت ( دقت بکنید درین صندوق نارنجکی چیزی نباشد ) اتباع اهمیت ندادند برای واز کردن صندوق کوشش کردند در این هنگام نارنجك انفلاق کرده برادر اسماعیل خان مقتول و خیلی از اقاربش مقتول و مجروح شده بودند . در عقب این وقعه عشایر شکاك هیجان پیدا و به طرف خوی رو نمودند و چند قریهای محال خوی‌را احراق و غارت کردند که از این تأریخ خصومت و مقاتلات در بین کردان و ایران موجود بوده شدت یافته . اسماعیل خان یار سال شهر اورمیه‌را باهمه اطراف و مضافاتش ضبط و در ٥ صفر ١٤٣٠ ساوجبلاغ و مضافاتش‌را استیلا و همه قوشون ایرانیان با رئیسشان اسیر و در آنجا حکومت کردی تأسیس کرده و اکنون بتأثیر نفوذ اسماعیل خان بانه ، سقز و جوار میان دوآب از دست ایرانیان نزع شده و دران جاها نیز حکومت کرد تأسیس نموده است .

∴

---

### اعلان

١ — چونکه او دو اعضای منتخبهٔ شار که له مجلس لوادا باقی مابونه وه به ارزوی خویان استعفایان کردوه امرو لازمه چوار اعضا له شار انتخاب بکرین . بناءً علیه صر له نوی انتخابات اجرا اکری . روز چوار شنبهٔ اتی که مصادف ٢٣ ی اغستوس ٩٢٢ له صبحینی ساعت یکی عربیه وه تا ایواری ساعت یازهٔ عربی له مواقع معینهٔ سابقه‌دا او منتخب اولانه که له طرف مختاروه ناویان نوسراوه بو امهٔ که دیسان منتخب ثانی انتخاب بکن مراجعت به او مواقعه اکن . هر کس لو مدته دا مراجعت نکا حق رای ساقطه .

٢ — اوانه که له پیشدا له طرف مختاره‌وه ناویان له دفتردا نتوسراوه هتا روز دوشنبه ٢١ آغستوس ٩٢٢ حق مراجعتیان به مختار ویا بلدیه هیه .

٣ — لپاش معلوم بونی منتخب ثانی بو انتخاب اعضا روزیك تعین اکری لو روزه‌دا منتخب ثانیه‌کان دینه اوطهٔ مجلس لوا . له حضور اعضای طبیعیه و دو کس له اشراف ممکت‌دا له نامزد له غیری نامزده‌کان لوانه که کیف مایشاء خویان به مناسبی دهزانن چوار کس به اعضایتی انتخاب دهکن .

٤ — له خصوص انتخاباته‌وه اعمال نفوذ قطعیاً ممنوعه .

له چاپخانهٔ حکومت له سلیمانی چاپ کرا

صاحب امتیاز و مدیر مسئول و سرمحرر
مصطفی پاشا

محرر کوردی و فارسی
علی کمال و م. نوری
اعلانات بدریك
۳ آنه ده سیترت
بو هه‌و شتیك مراجعت
به صاحب امتیاز اکری

محرر تورکی
رفیق حلمی

بو داخل شهر و لوابدل آبونه
۳ مانك دو ٦ مانك چوار
سالیکی ۸ روپیه‌یه
و خارج اجرت پوسطه
علاوه ده‌کری




(زمان گورزو رم رابوردو ایستا پالوان علمه)
(سلاح دسته صنعت پارۀ تیغ و سنان علمه)

سلیمانی
۲ آغستوس
۱۹۲۲

علمی ، اجتماعی ، ادبی ، غزته‌یکی حر و سربست ملیه
هفته جاریك دردچی

نسخه‌یکی به ۲ آنه ده‌فروشری

سال ۱    ژماره ٤    [ دوشمه ]    ٥ محرم ۱۳٤۱    ۲۸ آغستوس ۱۹۲۲

له استانبول :

## احوال ضابطان کرد

حرب عمومی که حربیکی مشئوم و بو تخریب مدنیت و انسانیت فلاکتیکی عظیم و معلوم بو له روی بعض بی مغزان که به وعده و پارۀ اجانب بی امن فریفته بون دولت عثمانی و بیرایی اقوام اسلامیه‌ی و حتی له تبعه‌ی غیر مسلمه‌یش زوریان لی محو و پریشان بو . کردان که له شماله‌وه بو جنوب قسم اعظم وطنیان بو بو به دار الحرب یعنی جی‌ء کشتن و برین بو به چه درجه‌یك متضرر و پریشان بون معلومه .

او امه‌ی که ام منطقۀ دار الحربی کردستانه‌ی دی‌بی دلخون‌بونیان بم پریشانیه ممکن نیه صرف‌نظر له صد هزاران که به دانه طوب به آگر میترالیوز و تفنك به طرقۀ بومبای ملعون محو بونه‌وه هزاران یتیم و یتیمه‌ی کردان عجزه‌ی نسوان پیران خسته و نالان له اثنای هجرت جبری‌دا له ناو بفردا ، له‌سر شاخاندا له ام‌لاوله اولا ، له برسانا و له سرمادا تلف بون .

هزاران شیرخوردی معصوم کریان و نالان به‌بی دایکی به‌بی غمخوری له ناو چون . ئه‌وانه بعضی که مابونه‌وه له استانبولا له پیش چاوی هموکس‌دا وکو اسرای زمان جاهلیت به ملالا تقسیم کران . زور اولاد معصوم خاندان کردان که به ناز و نعمت پرورده بو بون له زیر سه‌ی بی رحمانه‌دا زار و زبون بون حتی قسمیکیان دست مالی خرستیان کوتن هرچند جمعیت کردستان استانبول به تشبث له لای بعض اجانب صاحب انصاف بو اصلاح ام کاره و بو دستگیری او کردان بی چاره سعی و کوششیان کرد و حتی هر کردیك که منسوب به جمعیت بو دو ۳ مندال هتیوی کردی بو لای خویان برد باز له عهدۀ منع پریشانی مندال بی کسی کردان نهاتن . و هزاران خانوادۀ عشایر و اهالی مسکونۀ کرد که له اطراف ارضروم ، وان ، خربوط و سایره‌وه هجرتیان پی‌کرا بو اکثریان به تلف چون و له متباقیان هر پینج شش مالیکی له

دی یکی ترکا امکان کرابو فیری ترکی بین و مجتمع نیفنه‌وه .

له کویه قوم و خویشـام ببینن چون پریشانم
زونم لیم ددەن بوچی بلیم چی ترکی نازانم
بحالم مرحمت توخداً زبان نازان و بیمارم
له کوما دایك غمخوارم بیبنی چاو کریانم

منظرهٔ امفلاکته اوی که‌دی بیتی دیزانی و الحاصل هر وکواهالی کردستان له‌ام حرب عمومی‌به‌دا به‌خیرایی پریشان و سر گردان بون له ضابطان تحصیل دیدهٔ کردانیش قسمیکی زور له برناموس و شمرف خویان یا له‌جبهٔ حرب دا شهید و مجروح و یا له‌امارتدا پریشان بون . لپاش متارکه یعنی زمانی که‌اقوام به ادعای قومیت و سربستی هشیاری و بیداری‌یان بو حاصل بو ارناود . عرب و ساره هرقومی له شوبن ضابطان خویان کران جمعیتیان تشکیل کرد معاونتیان نواندو همویان بو وطن دعوت کرد اهالی سوریه بوشام عرب عراق بو بغداد ارناود بواشقودره وساره برناهی عودتیان میسربو .

کردستان جنوبی اینه چونکه وضعیت حاضره و مستقبله‌ی بو قرار دانی منوران و ضابطمان کافی نبو او ضابطه کنجانه‌مان چار اچار قسماً له برضیق معیشت چون بو انقره قسماً له استانبول دا بی وظیفه مانه‌ویان اختیار کرد و دائما منتظر اخبار مساعد وطن بون و هەن — چونکه له اول سفربری به‌وه فکر افتراق اقوام یك له کل یك دەبی کسب شدت دکا بو کردان له انادولی دا له ناو کالی به‌کانا مانه‌وه روژ به روژ مشکلات پیدا ددکا ابرامه احوال ضابطان کرد باخصوص خلق سلیمانی که‌له استامبول دان زور خرابه .

و همو بو عودت وطن به همو لایك دا مراجعت‌یان کردوه و ده‌یکن فقط لبر مصارف عظیمهٔ ریکا بو عودت کردنه‌وه موفق نابن — کاغذیك که به ناوی مطبوعاته‌وه له طرف چند ذاتیکه‌وه‌له استامبول نیرراوه له‌ژیره‌وه عیناً درج کرا و کاغذیکی ترکه‌له طرف بیکباشی ارکان حرب امین بك اهل سلیمانی بو ایمه روانه کراوه چونکه فارس العبارە بو‌له قسم فارسی ام غزته دا دیسان درج کرا له‌مطالعهٔ امکاغذانه احوال پر کدرکی و پریشانی ام هاو ولاتیانه‌مان معلوم دبی کسانی که‌رحم و امیدیان به هاووطن و کنجان کردان هیه دەبی بو عودت کردنه‌وه امانه همت عالی بفرمون و اوانه‌یش که ظاهراً محبت حکومت ترکیان هیه چونکه ام ضابطانه‌مان له‌خذمت ترکا بون و ایستا له‌احتیاجیکی عظیمان و تهی دست و بی دسلات ماونه‌وه دیسان همت فرمونیان طبیعی‌یه . وله‌ام ایشی خیره‌دا هر کس سعی بکات و معاونتی بنیری هم له‌دنیادا بوی باعث مفخرته و هم له‌آخرتدا و انشاالله مستوجب مغفرته .

هر کسی چی ده‌دا لطفاً ناو خوی بو اداره‌خانه‌ی غزته بنیری تا اعلان بکری و او مبلغه که کرد ده‌بیته‌وه بو اسلامبول بو ضابطان خومان بنام اشخاص محترمه‌وه بنیرری .

## مصطفی پاشا

او کاغذه‌ی که له استامبوله‌وه هاتوه ایمه‌یه :

۱۱ تموز ۹۲۲

اماوی بواسطهٔ ایوه‌وه مسئله‌یکی زور گوره عرض همشهریکان خومان بکه‌ین . زور امیدمان هه‌بو که ام ایشه له پیش مراجعتی ایمه‌دا له طرف (پیشکوتن) بیان و تعقیب بکریت ؛ فقط وا اسف تا ایستا له ام خصوصه‌وه هیچ شتیکمان نه‌دی . و به طبیعت متأثر بوین و ام مراجعتمان نتیجهٔ ام تأثراته‌یه .

معلوم ایوه‌یه که قسم کلی ضابطان و مامورین عراق ، له حرب عمومیدا بو طرف قافقاس و حلب ولام‌لا ولولا فریدران . بعضیکیان تلف بون وقسمیکیان اسیر مانوه و قسمی که زور کیان به صاغی نجاتیان

بو . ایسته اوانەی که اجلیان نەهاتبو و که نه مردبون ، له ایره له استانبولدا غریب و بیکس ، محتاج و پریشان ماونەوه . ایره نەکس رحم به حالیان دکا و نه ایوه لەوی فکری امانه دکەنەوه . ام حاله هیچ شبهه نیه که خلاف رضای خدا و پیغمبر و منافی حمیت و غیرت اهل وطنه . بالخصوص ام فقیرانه که عمدهٔ منوران اهل وطن لازمه فکر بکنەوه که له مدت چند سالدا پی گیشتون و آیا لەسر هموتان فرض نیه که چارەیکیان بو بدوزنەوه که بیانگەیننه بو وطن خویان . بی شبهه امانه و ملکت عنصریکی لازم و مفیدن و هیچ کس له خدمت امانه استغنا ناکات . اگر بنا لسر ناوی غزته کەتان به راستی فکر و آرزوی پیشکوتنتان هیه ، بتواوی محتاج خدمت امانن و الا نەهاتکی باش کوتن بو وطن موجوده ، حتی محققه ناقابل اجتنابه .

لەم خصوصەوه بو هموولایك نوسراوه ، بالخصوص ( به مندوب سامی که له بغدایه ) مراجعت پی کراوه . ازانین که له هموولایکەوه غیرت بو نجات بونمان دکن . فقط لسر روزنامهٔ ( پیشکوتن ) یش فرض عینه که صرف همت و غیرت بکا . چونکه ام قولاکت ذرکانه که ایره کوتونەوه ، زوریان خلق سلیمانیه و هیچ شبهه نیه اهل سلیمانی و اطرافی که به صلابت دین و غیرت وطن و همشهریتی مشهورن ، له هموولایك زیاترن . سماحت و جوامردی پیشان دەدن و به قدر حالی خوتان هرچندی ممکن بو ، به سرعت بو امانه اعانەیك کرد بکنەوه به ناوی ایمەوه ، که له طرف اوانەوه بو استامبولی انیرن و انشاالله له سایەی غیرت و حمیت اهل وطنەوه ام فقیرانه لیره رزگار دبن و به خزم و اقربای خویان شاد ابینەوه . باقی توفیق له خدا ، غیرت له ایوه .

زهاوی زاده بیکباشی — حاجی عبدالرحمن بابیر زاده
یوزباشی ارکان حرب — بیکباشی ارکان حرب
مصطفی کامل — محمد امین

آلوسی زاده طبیب — ثابت بگ زاده
ابراهیم — نوری

---

« دعای کردان بو موصلیان »

کاغذی که له موصلەوه ورگیراوه مسئلەیکی غریبی تیدایه — امەته :

« لەسر تنصیب حاکم عدلیهٔ موصل امین افندی »
« مدرس شیخ عادی که ذاتیکی عالم و فاضل و اهل »
« سلیمانیه وله امەوپیش قاضی بوه بو قاضیەتی دهوك »
« تعیین کراوه چونکه ام امین افندیه کوردیکی تواوه »
« مسلمانه له طرف بعض کسانی کەله ناچی کردن »
« مسئلەی مذهبی یان هیناوەته ناو و وتویانه قاضی »
« لازمه حنفی بی ام امین افندیه شافعی یه نابی بی »
« به قاضی لەمرامه مانع مأموریتی بون — »

فسبحان الله له ام وقته نازکەدا که عرب بغدادیش حظ به یك بون کردان دەکن له موصل دا که تحقیق و تدقیق بکری اکثر خانەدان و معتبرانیشی کردی اصلن ام قراره چون دەدری ؟ با خصوص اهل موصل عالم و قضایان تی دایه و دزانن که قسم اعظم ولایت موصل هر کرده و همو شافعی مذهبن دهوکیش شاری کردانه قاضی اگر شافعی بی مغایر شرع و قانون عجبا چی روادا ؟

ایمه ام مسئلەیه حوالهٔ مفتی یان عرب و عجم اکەین فقط ترجیح حنفی به سر شافعی دا لم جهتەوه به قراری کی یه نازانیایه . ایمه ازمین ام خره به بصر بکات ؛ اهل او حکومته کوردیه همو عربی منور و شافعین هروا اهل جاوه ؛ اهل داغیستان وقسم اعظم سوریه شافعین ام بحث حنفی و شافعی یه لەموصلدا

کی به خاطر یا هات یا رب وکو فرموته (من شـــر الوسـواس الخناس) ایمه له ام مباحثهٔ بی‌خبرانه حفظ بفرموی قوم و تبعهٔ شیطان نزیك به موصل له سنجار و شیخان دا ساکنن. دعا اکین موصلی هاودینیشیان له تسلط و وسـوسهٔ شیطانی محفوظ بن — امه دعای کردانه بو موصلیان.



(شیخ رقیب)

رییس عشیرت سورچی شیخ رقیب که له داخل قضای عقره‌دایه و دو سال مقابل به حکومت بریطانیا اوضاع و اطـوار مخالفتی نواندبو و له‌کل مخالفـان اکلیس که له رواندزن اتفاقی کردبو له‌ام بین پیشوه دخالتی به صالح ذکی بك قائمقام عقره کردوه و به طرف حکومته‌وه عفو کراوه.

. .

لم روژانه‌دا وکو خبرمان زانیوه زور ضابطان و و مأموران عثمانی که له انادول و ســوریه بوی ولایت موصل و بغداد عودتیان کردوه — هاتنه‌وه‌دان.

---

استقلال یانیه

لوندره: حکومت یونان له (یانیه) که له پیش حرب عمومی مرکز ولایتیکی مهم عثمانی بو له روم ایلی‌دا حکومتیکی مستقله‌ی داناوه.

[دیسان له ایرلانده‌دا محاربه]

لشکر وطنی ایرلاندا هجومیان کردوته سر شار [پتربری] له‌پاش محاربه‌یکی به شدت ضبطیان کردوه اهالی شاره‌که ام عسکری وطنیانه‌یان له‌کل نمایشـیکی زور پیشواز کردوه.

ام ایرلانده‌یه له مـدهٔ چند ساله‌وه خریکی ام کشمکشه‌ن بزانین آخریان چی ده‌بی.

§

[سمکو]

وکو خبرمان زانیوه له اطراف [شرفخانه] [له سر ره‌ی تبریز له ساحل شمال کول اورمیه] لشکر سمکو له‌کل لشکر عجم شریکی به شدتیان بوه کردان غالب و عجم وکو پیشو هر مغلوبن.

بانگ کردستان

---

نظر به مسموعات قسـمیك له بانه‌یی و مریوانی خریکن له‌کل هورامی به شر بین.

هورامی به قوت‌ترن و جنکاوه‌ترن بو مدافعه حکمتره خدا بکا فتنه له بین ام دو طایفه‌یه دا لاچی.

بنا به مسموعات له طایفهٔ هموند فرقهٔ رشـه‌وند هویان له‌کل طایفهٔ بکرزاده له آوی زی کویه عبوریان کردوه بعضیکیان چون بولای سمکو و بعضیکیشیان له ناو جماعت رواندزی‌دان.

---

له ام هفته‌ی پیشودا له طرف رواندزه‌وه جمعیك که تقریباً ٤٠ موجودی بو چابونه طرف ناوشت و پناو ترکه‌وه بو تعرضی به حدود رانیه (له زیر اشغال انکلیزدایه) بعض عشـایر و اهالیان تشـویق کردبو بومنع تعرض امانه به تصویب حکومت سیاسی ملیانی له عشـایر و اهالی طرف پشـدر و رانیه جمعیك زور حرکتیان کردبو وله طرف حکومتیشوه قوه‌یکی کافی له پیاده و ســواری بو او طرفانه سـوق کرا و زور طیاره پیوسته پیوسته بو سر اختفاکاه او متعرضانه نیردرابو ابر امه ایستا حرکتیان وسراوه تعرضیك بو رانیه نیه و بنا بمسموعات هموند کریم فتاح له‌کل او متعرضانه بووه.

### شفيق بك

له خاندانى سليمانى رشيد پاشا زاده شفيق بك كه له رأس العين قائممقام ملكى تركيا بوهفتهٔ پيشوتشريفى هاتوه وه بوسليمانى .

ام ذاته كه له رأس العين بو له كل ماموران فرانسز دوو وَ تسليمى كردوه وَ اوجيكايه كه له بين دير زوور وماردين دايه ايستا كوته ژير ادارهٔ فرانسزه كان . بنا له مقرراتى كه له بين فرانسزه كان وَ تركه كان انقره دايه ديرزوور ، رأس العين وجزيره (له شمال موصلو يه) ددريته ادارهٔ فرانسزه كان . واى بحال كردستان بزانين هاتبى چى تردبنى وادزانين ايش وابروا يعنى [متاكردان وها ورين له كل يك مائل شرين : نه آغاى دمى نين نه پايه و بوك و ياالله ] . احوالمان بم رنكه بى ام شقاوت و بى سياستيه مان دوام بكا له حكاريدا حكومتيكيش بو قوم آثورى كه له ملاوله ولا پراكنده جزؤيكيان ماوه تشكيل دكرى . اووخته كردستان شمالى له بين ارمنستان عجمستان ، فرانسز ، آثوريدا به چه سياستيك كذران دكا . خدا چاكيان بو بكا .

بانك كردستان

### اختلال له تركستانه كبيردا

درحق به بولشويك له تركستاندا ( چونكه تركستان كبير ملحق به ممالك روسيه يه ) اختلال شدتى سندوه اختلالجى يه كان بخارا ، سمرقند ، و بعضى شاران ترشيان استيلا كردوه او رئيس جمهوره كه له طرف بولشويكه كانه وه دانرابو اختلالجى يه كان اعدامان كردوه .

احوال ، مذهب و مقصد بولشويك لهمولا بيان اكرى .

بانك كردستان

### [بانك كردستان] ك توركجه قسمى :

معارفسز بر قومك حق حياتى يوقدر

معارف ، بر قوهٔ حياتيه دركه ، هر هانكى برملت او قوتدن مستقنى اولمازسه ، مليتن محافظه يه قادر اولهماز . معارف ، بر غداى روحيه دركه ، هانكى بر روح او غدادن متغذى بولنمازسه ، او روح لفائد انسانيه سى طاأروب يدهٔ شخصيه سنى تنو ايتديره ماز . معارف ، بر فضيلت فائقه دركه ، هانكى بر شخص اندن استفاضه ايله تحليل دماغ ايتمازسه ، حياتى حيات حيوانيه دن افرازه بر استثنائيت كوستره ماز ! اوت ، [illegible]ستره ماز ، چونكه : فضائل و مزيات بشريه نك [illegible]ت و قابليت لدنيه سى انكشاف ايتديره جك سائق معارفدر .

برقومك حق حياتى بخش ايده جك ، و اوحقى ادامه ايله هر درلو عوارض و اخلاقدن محافظه ايده بيله جك قوت معارفدر .

انسانك ، شرف و حيثيت مادى و معنويه سنى [illegible] الى ايتديره جك تربيه ، تربيهٔ معارفدر .

مابعدى وار

---

قسم فارسى [ بانك كردستان ] :

صبح چون خورشيد رخشان سر زد از كوهسار
بانك كردستان ما پرتو فشان شد آشكار

چون نسيم علم و عرفان بر مشامى ماوزيد
خواب پر شور جهالت كرد از سرها فرار

كر بجشم عقل ما دنت نايم اينزمان
قوم كرد از لطف حق هستند جمله بختيار

كور كشته چشم حاسد بختشان پژمرده شد
از ترقى و تعالى همين قوم كبار

روز عیش و شادی و گاه سرور عشرت است
لایق است گر جان خود سازم بدین مژده نثار

هر کسی اهمال ورزد بیگمان در وقت خود
رو سیه گردد بدیوان خدا روز شمار

قائم مقام الیجه
احمد مختار

---

سردار مکرما

بعد از عرض دست بوسی و آرزو مند معروض خدمت میکردد که از وقتی که تشریف سعادت ردیف عازم وطن شده تا به حال از ظهور التفات و پرسیاری سرکار محروم و لهذا مضطرب البال هستیم و لابد آمد وشد دولتخانه نمود هربار از عزیز بیك احوال آن سرکاررا پرسش می نمایم ولی تابحال چون از طرف سرکار امری و اشارتی صادر نشده بود یارای آن نداشتم که بچند کلمه ای تصدیع نمایم و انتظار ظهور آثار بنده نوازی می نمودم ولی چون تابحال چیزی ظهور یافته نشد بر خود لازم شمردم که بچند کلمه ای خودرا فرایاد خاطر عاطر سازم تا از جملهٔ بیوفایان معدود نکردم . کامکارحادثات و احوال اینجا روز بروز رو در خرابیت وچنانکه بارهاز طرف سرکار بیان فرموده شده بود علائم نیکی هم موجود نیست خدا رحم به حال معصومان و فقیران کند آمین بعد از تشریف سرکار بسیاری از اهل وطن از دیار اسارت به اینجا آمده کرد شده اند و در نهایتی پریشانی هستند احوال رحم و شفقت حکومت نزد سامی معلومست بنابر این کسی نیست که نظر به حال این بیچارکان نماید ما اینجا مجبور شدیم که بنام همه مراجعت بغداد و مندوب سامی بکنیم و کردیم و در این میانه جهت مظاهرت و اعانه نیز بهمه کس و همه جا نوشتیم من جمله بمتصرف و ریاست بلدیهٔ سلیمانی نیز نوشته شده است ارجو در خدمت باسعادت چنا است که در این خصوص مظاهرت فرمایند و این بیچارکان اهل وطن که در اینجا مانده و تاحال به جای نرفته اند بهر نوعی باشد بو وطنشان برمانند این خصوص جهت آن سرکار دشوار نیست و امیم که اگر جنابتان در اینجا بودی و پریشانی احوال همشهریهارا مشاهده کردی بهمه حال میکریستند و بزودی زود چاره اشان می فرمودند بنده در اینجا از معنویات آن سرکار استعانه نموده و مستندا بتوفیقه تعالی با چند از رفیقان نفس خودرا وقف این خدمت و التماس است که جنابتان نیز معین و منصر این امر خبر باشند و بزودی چارهٔ همه فرمود جلب نماید و الا همکی اینجا از گرسنه گی و پریشانی تلف میشوند و هیچ کسی در اینجا رحم بحالشان نمی کند خود احوال اینجا نزد سرکار بتمامی معلوم و احتیاج به تصریح ندارد بنده نیز بالطبع تابحال منتظر اشارات سرکار بودم و بنا بر امری که حین حرکت بواسطه ای نور عینی عزیز بیك به بنده تبلیغ فرموده بودند حاضرم باقی منتظر همت عالی و جواب صواب هستیم و بکمال حرمت با اهل و عیال دست بوسیم .

حاجی عبد الرحمن زاده
بیکباشی
محمد امین

---

اعلان

له کره‌ی درگزین خانوی حاجی احمد جادر چلبی که ایستا مکتب نمونهٔ عرفانه لو ینا بعضی تعمیرات و مپی کردنوی شش ژور و هوانیك بو درستکردنی کیه طالبه مراجعت به مدیر مکتب سعید زکی افندی بکا .

مدیر مکتب عرفان
سعید زکی

---

له چاپخانهٔ حکومت له سلیمانی چاپ کرا

صاحب امتیاز و مدیر مسئول و سرمحرر
مصطفی پاشا
محرر کوردی و فارسی
علی کمال و م نوری
اعلانات بدریك
۳ آنه ده سیتریت
بو همو شتیك مراجعت
به صاحب امتیاز اکری

محرر تورکی
وفیق حلمی
بو داخل شهر و لوا بدل آبونه
۳ مانك دو ٦ مانك چوار
سالیکی ۸ روپیه یه
بو خارج اجرت وسطه
علاوه ده کری

# بانگ کردستان

(زمان گورزو دم رابوردو ایستا پالوان علمه)
(سلاح دسته صنعت بارقهٔ تیغ و سنان علمه)

سلیمانی
۲ آغستوس
۱۹۲۲

علمی ، اجتماعی ، ادبی ، غزته یکی حر و سربست ملی یه
هفته جاریك دردچی
نسخه یکی به ۲ آنه ده فروشری

سال ۱ ژماره ٥ [ دوشمه ] ۱۲ محرم ۱۳٤۱ ٤ ایلول ۱۹۲۲

## بشارت بو دشمنانه کردستانه

له وقتیکا که اسلامیت وك سیل خروشان آسیا ، آفریقا و اوروپای استیلا کرد و له پیش انقراض متاسفهٔ حکومت اندلس دولت عثمانی له اوروپادا فتوحاتی به درجه یك وا ترقی کردبو له مدتیکی کمدا همو رومانیا ، همو بلغارستان ، همو صربستان ( که ایستا امانه همو یکی قرالیتیکی سربه خو و مترقین ) قره طاغ و یونانستان و بلاد مجاری استیلا و پایتخت مشهور و معظم ویانه ی محاصره کردبو نه تنها اوروپایی همو اقوام خرستیانیه و غیره له رجوشش ام سیلاب اسلامیته خوفناك و بو منع ام استیلایه له کل یکتری دایما حسبحالیان ده کرد و لرزه ناك بون . فقط بو مقاومتیکی مسلمانه به هیچ نوعی موفق نه ده بون . عالم نصرانیت له خوف و هراسیکی عظیمدا مات و مبهوت مابوه وه و به اتفاق عظیمیکی وك اهل صلیبش هیچ پیدا نکرا اکثر حکومات اوروپایی عاتا همو بو حکومت اسلامیه متبصص و کردن دادهٔ اطاعت بون له پشتر وك نه اندلسیان کرا به تقرب و

اختلات بو نفاق و اخلاق سعی کرا لم وقتانه دا له بین اقوام اسلامدا بعضی فساد و تفرقه حاصل بو فتوحات دستی کرد به وستان له ایراندا شیعیت تبارزی کرد و بم واسطه یه وه مخالف له خلافت معظمهٔ مهیبهٔ عثمانی له ایراندا به تواوی روی دا یعنی به راستی له سایهٔ مذهبیکی سیاسی یه وه ام حکومت عجمستان حاضره تأسسی کرد ایتر سلاطین عثمانیه له غربه وه بو شرق ورکران وحکومت عثمانیش به سبب بی سیاستی وتعصبیکی افراطکارانه وه ایرانیانیان حسن اداره نکرد له کل عجمستان طول مدت مشغول زدو خورد بون بم سببه وه اوروپا نفس راحتی بو حاصل بو ( لامارتین ) که یکیکه له عقلا و مورخین مشهور فرنك له کتاب خویدا توصیویتی بم نوعه : له وقتیکدا که شرق و غرب و عالم نصرانیت له بر سیلاب فتوحات اسلامیت و عثمانیت له تهلکه دا بو و بو امانه امید بقا نما بو بحمدالله له شرقه وه شیعیت و بم واسطه یه وه اختلاف و افتراق له بین اسلامیتدا حاصل بو ایتر خوف نما .

بلی ! قومی ملتی که له بین خویه نفاق و اختلافی
بو حاصل بی ایتر او قومه شرف و سطوتی نامینی دبی
به تابعهٔ غیره و اسف به واسطه‌ی حرص جاه و مکان
له بین خلق سلیمانیشدا احوال نامرضیه برودان دستی
کرد اوانه‌ی که دیانوت باوکم ایمه به غیراز کاسبی هیچ
ئازا بین کوتنه ادعای اعضایتی اوانه‌ی که له‌وقت خو پاشا
له کل ملت له کل وطن غیراز بدخواهی و خیانت
هیچی تریان نه بوه همو بون به احرار همو بون به وطن
پروزر ماله‌اومال دکرین له دیوانخانه‌یاندا غیبت دکن له
نیتاً بعضی جهلاداً به قصه‌ی عوام فریبانه ارباب فضل
و عرفان ذم دکن نازانن که ذم مذمومان دبیته باعث
تعالی و تظاهر شرف اهل عرفان هرچند اهل
ام مملکته کذزوه نان چاك و خراپ فرق دکن و ترجمهٔ
احوال او مفسدانه او کاسه لیسانانه دزانن فقط حیف
بو قومه که حیف بو ولاته که . اوانه‌ی که ترقی کردستانیان
ناوی ممنون دبن اوانه‌ی که چاویان هر له خذمتکاری یه
نانیان له روندابی بزانین تا کی ام ناپیاوانه نانی ناپیاوتی
و دو رویی دخون .

**مصطفی پاشا**

### تربیه‌ی اولاد

له ممالك متمدنه‌دا عادته هرکس مندال خوی
له‌کل خوی ده‌کیری مجلس علم ومعارفی پی نشان ادا
وبو امهٔ که له دماغ اومنداله‌دا اوحسه عالیانه جی کیر
بی حکایات حکمی پی دلی ، یعنی داتر به موجودات
ومصنوعات معلومات مختصره‌ی پی دلی ، له ده دوازده
سالیدا بوسیاحت به اطرافا دی‌کیری ؛ که‌کیشت به ۲۰
سال بوسائر بلاد وممالك متمدنه سوق اکات وبم رنکه
بو امهٔ که اولادیان تحصیل عملی ببینی سعی و غیرت
ده‌کن .

له جیاتی امه ایمه منداله‌کانمان که کیشت به ۳:۴
سال رلای دکین له کولانان فیری جاموکی ای یاخو
ای نیرته لای ماموستایك که له حجره‌کیا مندال دلتنك
دبی وناتوانی تیا دانیشیت بو امهٔ که منداله‌که مجبور کا
به دانیشتن یاقاچی دکاته فلاقه یاخود به قامیش سرسامی
دکا . پاشا لومندالانمان اوانهٔ حب علم ومعارفیان پی
بعضیکیان دچنه مزکوت له خذمت ملایکدا دس اکن
به خویندن علم له تصریف زنجانی یه‌وه دس پی اکات
دوسال تصریف زنجانی وسالیك عوامل کوره اپاش
۳ سال تصریف ملاعلی اخوینی .

که له تصریف ملاعلی بوه‌وه دس اکات به تماعی
هتا له جامی دبیته‌وه و یك دو کتیبی شرع دخوینی
یا آخری عمرتی دمری یاخو عمری دکاته ۴۵ ، ۵۰
سال ریشی سپی چاوی کم حکم دبی . اکر مسئله‌یکیشی
لی بپرسنه‌وه دلی باسیری کتیب بکم . ولبر بی اداره‌یی
سرخوی هلدکری دبی به ملای لادی .

اومندالانه‌ش که نه‌چنه مزکوت بوخویندن
بچنه مکتب ۳:۴ سال اخوینن اپاشا که ترفیعیان کرد
باوکو دایکی بوتحصیل دلی نایه مقداریکی کافی پارهٔ بو
صرف بکا وبنیریته مملکتیك تحصیلیکی مفید ببینی ی
دلی (اوا خویندنت تواوکرد ایتر چیت لی بکین بوچی
وکوکوری فلان عرضحالی نادیت به حاکم بی به پولیس
یابه فراش ) اومنداله فقیره مجبورابی دس اکا به عرضحال
نوسین به هاتوچوی دایره‌کان هتا ایشیك بدوزیته‌وه
لبرامه سفیل وسرکردان دبی .

له ام معروضاته سوء تفهم حاصل نبی بنده هیچ
وقتی نالیم خوانخواسته تحصیل مزکوت خراپه فقط له
لام وایه له مزکوتانیشدا وامهٔ که طلبه‌کانمان تحصیلیکی
باش ومختصر ببینن اصول جدیده‌یش تعقیب بکری و

وکو له مصردا له جامع ازهریدا تحصیل دکری ، تحصیل اصول عربیه وَ دینیه‌یش دیسان وا تدریس بکری و یاخود سالی دو ، سه فقیهی زیرك وگنج بو اکمال تحصیل بو مصر بوجامع ازهری بنیرری تاله کردستاندا علمای بافکر ومتفنن زور بی .

علی کمال

---

محاوره‌یکی اقتصادی

کاك رسول : هوومانده‌ونبی ! احواله‌کت چونه ؟ بوچی هاتویت ؟

صوفی مراد : خوا لیت راضی بی تا بابی خرابم !

کاك رسول : خوا نکات بوچی ؟

صوفی مراد : والله بابم چی سالیکه به خوم و مالومنداله‌وه خزمتی رز اکین ایکیلین ایبرین کچی ایستا هموحاصلانه کیم هیناوته شار اوا له خانه‌کی غفور آغا کوتوه پاره کوایکم بوناکات وحتی هیچ لیشنی نابرسن و چند روپیه‌یکی حق شکروچای اوپیاوش قرضارم اواهلی بچاوم نیه بیده‌می ایتر خرابی له امه خراپتر ابی چی بی

کاك رسول : توکواکت ندراوه کوا بوچ اکی ؟

صوفی مراد : بلی ! ندراوه بلام دلین باوی نماوه منیش مجبورم بی‌گوروم !

کاك رسول : هیچ مراق مکه بخوامنیش وکوتو وامه خوت ازانی چوارسال لمو پیش تریکی دو صد لیره‌یکم هبو بازرگان بوم هرضررم اکرد هموو وختی وارداتم له صرفیاتم کمتر بو ایتر بره بره کوتمه نهاتی بوم به عطار ایستاش کوتومته امحالتی سیل وبرده استی فروشتنه امه‌ش ادارم درناهینی وکسیش نایکری .

(لووخته‌دا شخارطه‌یکی هلکرت وجکره‌یکی داکیرسان)

صوفی مراد : مالویران که توسبیل کرکوك وبردواستی چاك و بوشوی ؟ طلاقت هیه له جکره کیشانت چی ؟

کاك رسول : کوره ام ایشه منیش وکوهته‌کی تووایه که توش میوز و خولاو و دوشاری سپی وسجوق وباسوقت هیه چیته له شکروچای ؟

صوفی مراد : بلی راس اه‌ی ام نکبته هومانی کرتوه تاکو دوم قوندره له‌ییکات کارکه‌چی عبا بدا به شانیا کابچی طاعین موصل بکا به فاوه‌لی توتونچی ابرکله صبل فروش جکره بکیشی صاحب میوز چای نوش کا جولا بلوری و طاقه له‌برکا دیاره شتی ولاتی خومان هرزان و بی‌قیمت ادبی وکس بی رضا نابی و شتی جیکایان تریش بم نوعه کران ادبی و له‌بری پاره‌یی پیدان ناکری .

کاك رسول : انجا چاره چیه .

صوفی مراد : چاره امه‌یه که ایمه ایتر نلین یا له بغدادی بچین و رانك و چوغه فری دین و عبا بدین به شانانا و لاین باندیو خنه‌که‌مان کرم بیت او شوچره خوشانه زمان باوکو بابیرمان ترك بکین صبره صیری سماورمان بیت .

شتی ولاتی خومان له‌ناو خومانا بی کرین و بی فروشین وپاره خومان نذین به شتی ولاتی تر ایتر خومان دولتمند ابین و قط فقیر نابین .

واکر امرو بیشمان نکریت استغنا له شتی اجنبی بکین والبسه محلی له‌برکین ، نه‌لین کواکه‌مان باوی نماوه کورج بچین جلی تازه

درست کین هیچ نبی د نك دونك الپسه

درست بی

خو اگر بیتو ماتگو مانك دفتریکی واردات

و مصارفاتی خومان بگرین و هموو وختی به

قدر واردات بلکو له برتنگانه له واردا بیش

کمتر خرج کین ایتر نور علی نور اه‌بی قطره‌ی

محتاجی نابینین .

کاك رسول : اشم بالله واز اه‌کی آفریم بو خوتو قصه‌ت

احمد حمدی

مجادلهٔ افکار

افکار متنوعه . حسیات متلونه

ح ـ هامه مالی مامم دانیشت وونی امرو قصه‌یکی غریبم

بیستوه !

م ـ آده‌ی بزانم چیه ؟ خیر ابی انشاالله !

ح ـ کوره نه بخوا نه خیره نه تره ماش !

م ـ ده دونکه بلی دلم تقی !

ح ـ کوره نازانم بلیم چی الین چوار اعضا بو مجلس

لوا تعین اکن ام اعضایانه و کوخاق الین اماندمن

به عربه‌کان خو بخوا اگر امه راست بی شتیکی خرابه

م ـ گوایه بوچی خرابه ؟

ح ـ له خراپتر چی تر هیه ، عرب خوی محتاج معونت

وارشادیکیکی تره اه‌ه بدرین بماوچون دبی استعاره

له مستعیرچون درسته ؟ سوال له سوالکر چون

قابله ؟ [کندیسی محتاج همت بر دده ]

م ـ بخوا من بزانم بماندمن به عرب شتیکی زور

باشه چونکه خوت ایزانی ایمه معاملات تجاریه مان

لگل اوانه ، هرچه توتومان هیه اچی بو اوی

شکروچاو کوتالیش لوان اکرین !

ش سلام و علیکم .

م ، ح ـ علیکم السلام . فرمو دانیشه .

ش ـ بخوا ایتم میه

م ـ توخوا دانیشه تۆزی کوی لم قصانه بگره .

ش ـ کوره قصه‌ی چی حقم چیه به‌سر ام قصانه‌وه

خوای اگرد دنیا بسر یکا کاول ابو .

م ـ آخر چی بوه ؟

ش ـ کوره نازانم بناخیرم امسال نموانی دمنم دابه او

خان و دوکانانه که تواو یان بکم و نجاتم بی یکی له بو

بلدیه نه خشت مور نه کج به قسل دست ناکوی .

م ـ اما مالت ویران بی یکی داوای عرب یکی بم بسته

ارضه‌وه داوای حقوق ملیه‌ی خوی اکا یکی

پروپاغنده بو تورك اکا یکی تو هر له‌سر فالك و

فیکی خوتی .

ش ـ کوره باوکم من دخلم چیه به‌سر ام نه‌وه من اوی

که سعی امسالم باراتی بله بی تیبینیته‌وه ایوه اگر

حظ لم نوعه قصانه اکن راوستن ایستا . . . نان

بو انیرم .

اوندهٔ دم به جکره‌یکه‌وه بنی کابرای نارد .

س ـ که هات بی سلام فیسه‌کی له‌سری داکرت دانیشت

وتی اوه باسی چی اکن .

م ـ باسی خومان اکین .

س ـ له‌پاش مکالمه‌یکی زور وتی باوکی باوکم ایوه هیچ

نازانن هر له‌خوتانه‌وه قصه اکن ایمه اسلامین ترك

دولتیکی اسلامه هچی اوی خوش نوی کاره امر

ایمه وا لازمه دایما هر ترکمان بوی . چونکه ولی

نعمتی قدیمانن .

م ـ ماشالله ای عرب اسلام نین هر ترك اسلامن

خوا که فرمویتی (انما المؤمنون اخوة) هر مقصودی

ترکه نه والله مقصدی عربیشه .

و ـ لوی‌وه وابورد که کوی لم قصانه بو راوستا .

س - دوام له سر قصه کرد و ایوت تورك ماتیکی بسور وازایه بزانه لم روزانه دا چون سمکوی محو کردوته وه .

و - به حدّته وه . چی چی چی !

س - اتجا حدت بوچ اکی ـــا بخوا لم روزانه دا پازه قول اوردوی کالبه کان ون بو بو وختی خبریان زانرا هر له چاریه وه که پایتخت سمکو یه شـوتانیان و تالانیان کرد و سمکو یشیان اسیر کرد .

ماوتی

---

## سمکو و عجم

بنا له اخبار اسـتامول غزتهٔ الرافدان نوسی ویه که لشـکر سمکو داخل تبریز بوه . وزارت طهران له خوفا طلب معاونت و امـدادی له فرقهٔ یازدهم بولشـویك ( روسیه ) کردوه .

«صبا هاسه دخیلت بم برو بو چاری لای سمکو»
«بلی تاوی بدا اسپی هتا تبریز و تافلان ڪکو»
«همو کرانج کرمانشاه به آواتن به جان و دل»
«منه حاضر همو خاق دلین بی لشکر سمکو»

---

## احوال سوریه له گل فرنسزه کاندا

( سلطان پاشا الاطرش ) که رئیس عشیرت درزی یه له ژیر قوماندهٔ خویدا جمیتی که همو درزی بون له علیهی فرانسزه کان هلساون و بو سر قوتیکی فرانسز که عبارت له ٦٠٠ سواری و له اطراف شهر صیدایه هجومیان کردوه له مصادمه دا له فرانسـزه کان ١٧ سواری و دو ضابط کوژراوه . فرنکه کان بو امهٔ له اطراف عسکر کرد بکنه وه امانیان بردوته جیکایکی مستحکم خویان .

ام عصیانه زور دوام اکا . طیاره یکی فرانسزیش کوتوته خواردوه له اهالی جبروت کلی کس هجومیان کردوته قشلهٔ فرنکه کان ١٥ عسکریان کشتوه .

له شامدا او روژه حکمی که له علیه اعضای جمعیت ( حزب الحدید ) صادر بوه له طرف اهالی یه وه نمایش کراوه بسته و کورانی ملی خویندراوه زه یش لم نمایشه دا اشتراکیان کردوه . ژنان لای خویشیان هر لایه لایه دزانن و تشی دربسن .

## بولشویك و بریتانیا

استامول ١٣ آغستوس ٢٢ — به نظر تلغرافیکه وه بولشویك روس له نزیك باطومه وه به بهانهٔ که له پیشا عائد به روسیه بون ٣ واپوری انکلیزیان دست پیا گرتووه و لبر امه که تجارت بریتانیا وستاوه له طرف بریتانیاوه پاپوریکی حربی بو باطوم نیرداوه .

استامول ١٠ آغستوس ٢٢ — قوتی یونان که له بکیاوه بو سر استامول بو حرکتیان امر درابو له سر خط چتالجه وستاون ودستیان کردوه به گرانه وه .

قاهره ١٣ آغستوس ٢٢ — له ماموران موظف وزارت زراعت مصر [میستر براون] لکل مندالهکانیا له ناو عربانه دا که بو مالی خویان گرانه وه پینج کس به لووره وه هجومیان کردوته سر . عربه چی یه ڪکه کوژراوه ، میستر براون خوی و مندالیکی و داین مندالهکانی برینداربون . متجاسر ام جنایته هرچند دلین طالبهٔ مکتب بون اما هیچیان دردست نکراوه .

## تبشیرات

**٩ محرم ١٣٤١**

بو مقررات کردستان مدتیکه جناب حاکم سیاسی سلیمانی له کل مندوب سامی و ام ذاته یش له کل لوندره مشغول مخابرهن جناب مندوب سامی ایستا جناب میجر کولدسمیثی مأذون و مفوض فرموه :

که به عموم اهلی لوای سلیمانی خبربدات عنقریب میدانیان ده دریت بو حل کردنی مسئلهٔ تشکیل کردنی حکومتیك بو کردستان یعنی به سربستی فکری خویان درمیان بکن و بو حصولی ام نیته خیره جناب مندوب

سامی لەگل حکومتی انکلتره حریك مخابره‌یه تا حکو
ترتیبکی باش دابنریت و لم روژانه دا به هاوی تبلیغ
بته یم ده کریت .

جناب شیخ محمود افندی لەگل شیخ محمد غریب
افندی له گریته بو بغداد تقلید له طرف حکومت
مفخمهٔ بریتانیاوه مساعده کرو .

بانگ کردستان

## پولونیا

حکومتی تازهٔ پولونیا که نفوسی تقریبا بیست ملیون
دەبی و اراضیەکی معدنی زور وبه قیمتی هیه له ترسی
مخاطرهٔ بولشویك روسیه و چاو طمعی المان مجبوراً
لەگل فرنسه وبلچیقا اتفاق بستوه .

نظر به مسموعات تازه‌وه له‌هموند له طایفهٔ بکزاده
کریم بك تتح لك له طرف بو دشت عاوه بو چه طرف
چووه معلوم نیه وضع و حال راپیه . تو له نسخه‌ی
پیشودا نوسرابو هر وایه فقط قوت تازه‌ی حکومتی
له گل طوپ و سائره کیشتووەته دربند .

مزده بو [ لامان باشه] کان

لم روژانه دا شایەیکی غریبتر هیه که له افواد
خواص دوران اکات : دلین له بغداده‌وه ١٦ ذوات
تشریف دهینن بوسلیمانی گویا امتیاز بعضی معادنیان
ورگرتوه یاخود وری دگرن وگویا امکسانه له سلیمانیدا
چونکه اوتیل ، ریستوران و سائره نیه له مالی [ لام
باشه ] نا مهمان دبن . ایمه ایستا بوصر سم خوش آمدی
هیچ نانوسین تا بزانین راسته یاًا فقط احوال کردستان
بم نوعه کوا دەی بینین به معنی ماوه ملك ام قومه
معادن غیر مکشوفة به قیمتی ام ملته‌ی دەی فروشو
به کی ها ددری ؟ اگر معادن خنوز و نونه حدنا
دوکلی امانه زورشی به هیچ لایك ندا اکر زیوو آلتونه
[ وتکوی بها.....] اوانهٔ که حظی پی دکن له حکمی

ام آیته کریمه یه محفوظ بن .
امه دعای بانگه . بو اومهمانانه‌ش ام بانگه .

حفید زاده جناب شیخ قادر افندی ایستا تشریفی
کیشته سلیمانی بخیر بی .

هاتن و روین

له اذکیای گنجان وطن مفتش پوسته وتلغراف
جناب احمدنوری افندی که مدتی بو له کرکوکه‌وه بو
تفتیش بوسلیمانی هاتبو روژیکشنبهٔ بشوعودتی کرده‌وه
بوکرکوك خدا حافظی بی .

## اعلان

دوسیه ٧٩ — ١٩٢٢
او خانه که له بازار سلیمانی و به خانه سته‌تاو
معروفه ربعی عائدبه محمود پاشای جوه به ٦٠٠٠ روپیه
بو عهدهٔ مشتری احالهٔ اولیه‌ی کشیده و بو احالهٔ قطعیه
تا پانزه روژ وضع مزایدهٔ علنیه کرا لم مدته‌دا صدی پنج
ضمائم قبول دکری هرچه طالبه صدی ده تأمینات
مستصحباً مراجعت به دائرهٔ اجرا و منادی توفیق آغا
بکات .

٣١ آغستوس ٩٢٢　　　　مأمور اجرا
　　　　　　　　　　　　م . وهبی

دوسیه ١٧٦ — ١٩٢٢
خانویك له کرکی کویژه واقعه و به خانوی قادر
و حمه رسول و حاجی فرج و طریق عام محدد
اعتبار شش بش یك بشی که عائد به حمه
له مانی مارەبی ژنی خدیجه افروشری بناءً علیه به احالهٔ
اولیه تا ٣٠ روژ وضع به مزایدهٔ علنیه کرا هرچه طالبه
صدی ده تأمینات مستصحباً مراجعت به دائرهٔ اجرا
و منادی توفیق آغا بکات .

٣٠ آغستوس ٩٢٢　　　　مأمور اجرا
　　　　　　　　　　　　م . وهبی

لەچاپخانهٔ حکومت لەسلیمانی چاپ کرا

صاحب امتیاز و مدیر مسئول و ... محرر
مصطفی پاشا

محرر تورکی
رفیق حلمی

محرر کوردی ، فارسی
علی کمال ... [illegible]

# بانگ کردستان

بو داخل شهر ولو بدل آبونه
۳ مانك ده ، ٦ مانك جوار
سالیکی ۸ روپیه

ا[illegible] [illegible]
۳ آنه [illegible]
و همو شتیك مراجعت
به صاحب امتیاز اکری

بو خارج اجرت پوسطه
علاوه دهکری

(زمان کوردو رم رابوردو ایستا پالوان علمه)
(سلاح دسته صنعت بارقهٔ تیغ و سنان علمه)

سلیمانی
۲ آغستوس
۱۹۲۲

عامی ، اجتماعی ، ادبی ، غزتهیکی حر و سربست ملی یه
هفتهٔ جاریك دردچی

[illegible] به ۲ آنه دهفروشری

سال ۱　　ژماره ٦　　[ دوشمه ]　　۲٦ محرم ۱۳٤۱　　۱۸ ایلول ۱۹۲۲

[illegible] تو
[illegible] پهلوی کهی بی بهسر کردا بنیشی تو
همو قومی به دولت بو کچی کردان لهکل یکتر
خریکی شورشن یارب وکو گورکان لهکل یکتر
برابین اتفاق کاین خریکی کار خومان بین
نهکو تا روز محشر دی اسیر قوم دیکر بین
برا کرمانج و کرد و لور همو یك بین لهکل زازا
که ایمه پهلوی اصلین بزانی اهل اوروپا
صلاح الدین ایوبی له پشدر هاتو چو تا شام
لهبری ایمه ایستاکه باین هر نوکری چاکه
بزانن جولکه و ارمن به دولت بون کچی ایمه
دباین هر نوکری چاکه له بومان نوکری چاکه
بهقول مفسد و بدگو لهکل یك تیك مچن ایتر
اگر لهم پنده کونگرن بهمردن چن لهژین چاتر

---

بدات انقلاب و انتباه بو کردان
روژی ٥ ایلول ۹۲۲ صبحینی زو جناب جلالتمآب
حفید زاده شیخ عبد القادر افندی له ...

اوا که عبارت بی له مصطفی پاشا ، [illegible] آغای [illegible] آغا ، عبد الفتاح چلبی ، مجید افندی حاجی رسول آغا وله اشراف احمد بك توفیق بك به تذکره له طرف حاکم سیاسی یه وه بو جیکای طیارهکان که له کنار شاره دعوت کران ذاتاً روزیك لهوهپیش شش طیارهٔ گوره هاتبو ام ذاتانه له ژیر چادریك دا گردبونه وه اطراف موقع طیاره به زنجیرهٔ نوبتچی عسکر محافظه کرابو له اهالی مملکت بو سیر جیکی غفیر وستابون له هیچ لایکهوه به قدر ذرهیك آثار بی نزاکتی نبو .

حاکم سیاسی میجر کولدسمیث متوجه به همومان وتی ( بنا به امریك که له بغداده وه له مندوب سامی ورم کرتوه ایستا سلیمانی تخلیه دکین ، عسکر ، پولیس اسلحه ، جبخانه ، پاره ، ارزاق و سائره همو لهجی خویانا ترکان کرد . بو ادارهٔ خوتان فکر بکهنهوه و امه کلیدی خزینه یه تسلیم به کی بکهم وتی کی به رئیس مجلستان انتخاب دکن همو حاضرون وتیان جناب

شیخ قادر افندی ایستا مناسبه فقط لازمه ساعت اول جناب شیخ محمود افندی بێتەوە ایرە تا ادارهٔ امور تأمین بکری لەسر امەکای گفتگو بو و لەطرف اعضاکان بعضی سوأل و جواب کرا حاکم سیاسی لە جواب هەودا هر امەی دووت ( وقت قصە نیە ایمە ایستا داوین ایوە فکر ادارهٔ خوتان بکەن مجلستان هیە ، اعضاکان حاضرن ، مادام کە شیخ عبد القادر افندی‌تان بە رئیس مجلس قبول کرد و اعتمادتان پی هیە بو ادارهٔ هەمو امورتان ، بو محافظهٔ آسایشتان بە قراری مجلس ایش بکەن ایمە بموجب امر قطعی کە ورمان گرتووە هرچی مأمور انکلیسە دبی سلیمانی تخلیە بکات . ) لپاش ام قصانە حاکم سیاسی خوی و معاونی و قوماندان عسکری انکلیس لەکل حاضرون وداعیان کرد و هیئت جی طیارهٔ ترك کرد و عودتیان کردەوە بو شار لە پاش امە مأموران انکلیس بەطیارە دستیان کرد بەحرکت ام ملاقات وختام ووین انکلیسە لەساعت یکی روژەوە هتا ساعت شش روژ دوای کرد فقط ام تأخرە بو انتظار هاتن میجر نویل حاکم سیاسی انبجە و مناطیق جاف بو . کە او نهات امان حرکتیان کرد . اعضاکان مجلس لە ژیر ریاست جناب شیخ عبد القادر افندی‌دا هر او روژە ساعت لە پێنج لە دائرهٔ حکومتدا کرد بونەوە چونکە امنیت بە انتظام عسکرەکە بو لەطرف مصطفی پاشاوە تنبیهات و اخطارات لازمە بەهیئت عسکریە کرا هەمو ضابطان و عسکر هتا تشکل حکومتیك لازم بو محافظهٔ ملت و وطن و علی الخصوص بو اسلحە و جبخانە و خزینە هەمو عهد و میثاقیان کرد . بو شو و روژ دوریە و سائرە ترتیب کرا هراو روژە انتظام و همت عسکریە و فطانت ضابطەکانیان مشهود عامە بو و لە داخل و اطراف شاردا آسایش محافظە کرا . روژ دوم هەموند کرم فتاح بك محمد امین آغای فقە قادر لەکل فقە محمد حاجی کە رئیس رشەوندە لەکل کورانی کاك عبدالله عزیز خالە و اتباعیان داخل سلیمانی بون .

جناب سیادتمآب حاکم سنکاو شیخ عبد القادر افندی و مخدوم محترمی جناب شیخ مصطفی لەکل اتباع و اعوانیان لە پیشتر ذاتاً وارد سلیمانی و مشغولی محافظە امن و آسایش بوبون .

روژی ٣ یم کە روژی جمعە بو ولە بین بعضی اهالی داو باخصوص لەافواه هەموندکان داکە لەطرف رانیەوە هاتبونەوە هاتنی عسکریکی بی شمار ترك لەکل طوپ و مترالیوز و سواریکی زور کە لەدوکانەوە دین بو سلیمانی دورانی دکرد کرچی اهالی سلیمانی و هەمو کردستان سبب بەرابطهٔ دینی بەرە لە آوازهٔ هاتنی اوردوی ترك ممنون بونیان طبیعی یە فقط شایان تعجب اوانهٔ لە مقابل او خدمتانە کە بویانە بو انکلیس نایل ثروت و اکرام بون و لە زمان انکلیسدا خویان بە مقربین و فداکاران حکومت بریتانیا نشان دداو روژە بو صفر ماسبق احوال خویان لە ملت و یا بو انتقام لە معارضانیان و بوامە کە اکر حکومتیکی کردی یاخود ترکی تشکل بکالە میشدا بو خویان جی یك بکن بە درجەیك بون هر کس باوری نکردایە بە هاتن هشتا هزار موجود پیادە و سواری و هزاران طوپ و مترالیوز ترکی و یاخود بە دلیکی صاف بی وتایە کو والە کوین تو خدا با ایمەیش بی زانین ایترا و بدخواهانە ، او دشمن هم وطنانە او منفعت پرستانە بە جهلایان دوت (تماشا کن فلان اعلامیتی ناوی ، حظ بە کاور دەکن بە هاتن ترك ناکن ) و هم فکری خویان بو اختلال تشویق دەکرد لو وختەدا بو کە نویژی جمعە تواو بو بە امر جناب شیخ قادر افندی وجوه و اعیان و معتبران مملکت لە درو ژوری دایرهٔ سیاسی‌دا بە ازدحامیکی عظیم اجتماعیان

کرابو و تذکر ۳ مسئله دەکرا — که بو ام ۳ مسئلەیه هر کس به اجتهاد خوی بەنوسی یاخود بزان فقط آشکارا هر فکری بیان بکا قطعیاً لە یکتری دلگیر و درحق به یك ابدا مغلوب غرض شخصیه نبن — و هەو به قرار اکثریت تابع بن بو امەمقصد دامه به قرآن و به آیات سوند خورابو له پیش ام سویندەیشدا هر او روژه کەانکلیسەکان سلیمانیان تخلیه کرد به قرارمجلس کە چند کسیکی زلە وجوه مملکت له خارج اعضایان منتخبهٔ ملی لمصلحت احضار کرا بون تأمین نامەیکیان نوسی و امضایان کرد کس لگل کس غرض شخصی تعقیب نکات وصرف بو منافع ملت و وطن سعی بکری و لە بینا هیچ هیچ تحریکاتی نبی — له پیش شروع ام مذاکرەیەدا جناب شیخ قادر افندی اکل اعتنا بوخلافت اسلامیه دایر به قومیت وملیت بعضی کلمات معقولهٔ بیان فرمو .

او ۳ مسئلەیه کە مذاکره کرا امانه بون :

۱ — تشکیل حکومت بو کردستان

۲ — قبول و استقبال کردن عسکر ترك

۳ — هر کس دەیەوی آرزوکردنی حکومت انکلیس بصراحت ووتن .

اوانهٔ کەلەسویند و تأمیناتی که ذکرمان کرد مشترك بون هیچیان به صراحت قصەیەکیان نەدەکرد — فقط بو امه که افکار وجوه واشراف و منوران له نظر یار واغیاردا معلوم بی و اکثریت بزاری لەطرف مصطفی پاشاوه دفتری طلب کرا کەهر کس فکر واجتهاد خوی بنوسی تا امضاکان معلوم وجمع بکری واوی نوسین تزانی بواسطهٔ مؤتمنانی ثبت دفتر بکا ام تکلیفاته هیچ فائدەمند نبو حاکم قضا رضا بك که له زمان انکلیزدا له انتساب به جمعیت کردستان تحریرا استعفای کردبو و لم روژانه دا یعنی لەپاش روینی انکلیس بنا لە سر شایعهٔ هاتنی ۸ هزار عسکر ترك له نظر بعضی اشخاصدا خوی زور به طرفدار ترك خواهشکر نشان دەدا داماية سر پی وتی ( لەسر کاغذ بو چی بنوسین هیچ کس طرفداری انکلیسه دس هلبری بزانین ) نتیجه یك حاصل نبو .

لپاشا دیسان هر رضا بك به آوازیکی بلند وتی ( کی کردی دوی دس هلبری ) غیر خوی و چند کسیکی محدود نبی به جاری گوره و بچوك به شدت دسیان کرد به ام آوازەیه ( لەگل خلافت و اسلامیت معلومه هر بژی کردستان حکومت کردستان ) و به جاری چپلەیان لیدا و له حسرتدا آو له چاویان دهات و وتیان حکومت ملیمان دوی ، حکومت کردستانمان دوی . لپاشا رضا بك وتی من هیشتا سؤالم تواو نکردوه .

مصطفی پاشا لو وقتەدا چونکه له مجلس دەچونی لازم بینی بو له رئیس مساعدهٔ طلب کرد فکر خوی بلی و وتی مادام که له سر کاغذ فکر نانوسری اکثریت چلون معلوم دەبی فکری من لەگل رابطهٔ خلافت و اسلامیت بو سلامت وطن تشکل حکومت ملی کردیه هر کس فکری لم مرکزەدایه به آشکار بیلی ویا بینوسی لەگل امه هرچی معتبران ومنوران کردستان وحاضرون بون غیری ۳ ، ٤ کس هەو بجاریك ام فکرەیان پسند و به آوازهٔ مسروریتیانه دائرەکەیان پر کرد . لەسر امه رضا بك وتی ( امانه مندالن به قصهٔ امانه چون دەبی ) مصطفی پاشا لەجوابیدا وتی تو بوچی فکری خوت بەموافق قرار نانوسی یاخو به آشکرا نایلی ی دو سەیکی تر وتیان امه به آشکاری نابی بیان بکری و اسمی ایمه له سر دفتر وکاغذ نابی بنوسری . جناب حفیدزادە سید عبد الله افندی هرچند کاغذ و دفتری هینایه پیشەوه و تکلیفی نوسینی فرمو فایدەی نبو . لە ام اثنایەدا کابرایکی روتەله به واسطهٔ قومیسر

حلمی افندی یه‌وه تقدیم به مجلس کرا . و وتی قصه له‌ام پیاوه ورگرن زور مهمه . کابرا که وتی : ( اوا ایستیه لشکریکی زوری ترك طاقم طاقم ، طابور طابور پیاده و سواری گیشته شیوی آودار که نزیکی شاره خوم چاوم پی کوت هاتوم خبر بدم . ) له‌سر امه جمعیت بلاو بونه‌وه و هاتنه دره‌وه هتا بزانن ام لشکره چیه مصطفی پاشا بو محافظهٔ آسایش مملکت و اتخاذ ترتیبات به عسکره‌کان امری کرد له زیر وماندهٔ ضابطان خویاندا گرد ببنه‌وه هتا معلوم بی چیه . له ام وخته‌دا مصطفی پاشا له طرف کریم بك فتاح بك رئیس همووند و اعوانی یه‌وه کتوپر گیرا و هر لو آنه‌دا و لو جیگه‌یه‌دا قومیسر حلمی افندی که له‌گل چند پولیسیك نزیك کریم بك بون مصطفی پاشایان به زور برد و حبسیان کرد .

له‌سر امه‌ی که مصطفی پاشا حبس کرا — و حبس کردن ام ذاته بی معلومات رئیس مجلس ملی بو که اسبابی له نسخهٔ آتیه ده‌بیژری همو اشرف صاحب حمیت و همو منوران مملکت کوتنه تلاشه‌وه و نزدیك بو که کلی وقوعات غیرمرضیه رو بدا جناب شیخ عبدالقادر افندی مدیر منکاو له‌گل شیخ مصطفی افندی مخدومی جهد و جدی کلیان کرد الحمدلله بی امه‌ی که وقوعاتی رو بدا هر او روژه ایواری برلا بو و پاشای مشار الیه له بردم سرادا له طرف جمع غفیر منوران و وطنپروران به شادمانیکی عظیم استقبال کرا له پاشا هر او شوه له طرف عسکری و پولیسه‌وه انتظام و ترتیبیکی باش دامزرا مملکت کوته حالی آسایش و سکونه‌وه و الحمدلله ایستا احوال چاکه . ام خبره مصطفی پاشا له کیشته رؤسا و بکزاده‌کان جاف و پشدر بو همویان موجب اسف بو که امه چه مسمایك وجه تحریکاتی بوه

مابعدی هیه

### پیاوی عاقل فرصت له دس نادا

وارستهٔ عرض و ایضاحه که حکومت عثمانی له پیشدا عشیرتیکی چوار صد مالی بون له ترکستانه‌وه هجرتیان کرد له آخریا له سایهٔ سعی و اتفاق خویانه‌وه بون به او حکومته عظیمه که چند ممالکیان داگیر کرد و شرق و غربیان هینایه لرزه .

له‌همو کسه‌وه معلومه که صرب ، قره‌طاغ ، یونان ، ارناود نفوسیسان پینج یکیکی نفوس کرد نابی له‌گل امیشدا هر یکی حکومتیکی سربه خون وهرچی بو خویان چاك بی دیکن

ملت کرد له‌گل امیشدا که امرو صاحب نو ملیون نفوس زیاتره هتا ایستا هیچ نام و نشانیکی نیوه .

لبر امه‌که له‌امو پیش له زیردست اجانب دا بوه بو ماسبق معذرت قبول اکری اما بو دوا روژمان اگر فکری نکینه‌وه و بو خومان ناویك پیدا نکین و هروها بی ناو بمینه‌وه نسل آتی به نفرین ناومان ابن و لناو مال سائره‌دا تعییب اکرین .

تماشا بکین چندسال لوپیش له زوریکی تاریکدا به دزی‌یه‌وه نمان ده‌ژوانی ام قصانه له‌گل محرمیکی اسرار خوماندا بکین امرو خدا ام فرصته‌ی دس خستوین که ام افکاره اتوانین بخینه سر کاغذ و له غزته‌دا بی نوسین و بلاوی بکینه‌وه — هیچ مانع و محذور له میدانا نیه .

اگر ام فرصته له دس بدری دبیت له همو قومی کمتر و بی شرف‌ترین .

من که یکیکم له افراد ام ملته به ناموس و شرف خوم عهد و پیمام کردوه که اگر لناو ام قوم نجیب کرده‌دا حریف مامه به وزمه‌وه و ام فرصته لدست بدری نامیهم سیاپوش بم و لناو ام قومه‌دا بروم ه

دره‌وه و اوانه‌ی که دبن به مانع ام حسیات ملیه‌یه خدا قهری بکا .

حشمت . عبد لقادر

..

دیسان سرداو نصرت :
( سمکو ) اسماعیل خان

بنا به اخباریکی تازه که له بانه‌وه ورگیراوه جناب اسماعیل خان ( سمکو ) له پاش امه که مقر خوی یعنی ( چاری ) ترك و تحصنی به موقع منیع شاخان سومای ولشکریکی عجم بیشمار چاری و اطرافیان همو استیلا و یغما کرد سمکو چند روزی ام احواله صبر و تماشا و هم وه له وه عجمکانی اغفال و تدارکانی خویشی اکمال دکرد لپاش ام استحضارانه شو یك به سر لشکرعجمدا شبیخونیکی ماهرانه کرد و به روایتیکی موثقه مرتب پینجهزار نفر تلفیات و برینداری به اوردوی عجم دا و له‌پاش امیه‌ش بو اطراف تعمیمی نوسی که حسب الانسانیه هر کس و هر عشرتیکی کرد به قدر امکان خوی بو کفن و دفن او عجمانه معاونت نقدیه‌ی طلب کرد له سر ام غالبیته‌یش دیسان جناب ( سمکو ) عودتی بو چاری مناسب ندیوه و له‌کل ترتیباتیکی مخصوصة خوی مشغوله . بزانین تا ام حمله دوه‌ه بو کوی یه والحاصل جناب سمکو دیسان غالبه ایه ذاتاً تا ایستا به مغلوبیتی او چونکه به راستی باورمان نکردبو هر بحث غالبیتی اومان دەنوسی . و انشاالله هیچ کوردیك لسر حق مغلوب نابی و له خدا تمنا ده‌این ام اختلاف و منازعاته له‌بین کردان یعنی قوم پهلوی و عجمدایه به زوی مبدل خیر بی تا له هر دو طرف نوع بنی بشر و مسلمانان ایتر ضرردیده نبن چونکه کورد بو ایه چند مطلوبه دوستی همو ایران و عجمان که خاندان محترم و منوران به قیمتی زوره بو ایه اونده به قیمت و بی وسته .

بشارت بی دلی سمکو هجومی کرده سر ایران پلاوه کرد عجم تیکچون و کو ریوی له‌ بر شیران شبیخونیکی مردانه شکاك و هرکیان کردی بانه‌ی کرد بحمد الله کلاه و طیله کردان دساکوردان فداتان بم هوهلسن به یکجاره نتیجهٔ ام شسره خیره که استقلاله بو کردان

رو به قبله دست به سینه بو کوبتن چاوه‌ری کورد وکوران هر دلین یارب محمود بیته‌وه



—[ بکزادان جاف ]—

بکزادان جاف که به وطن پروری و سعی و کوشش بو ترقی معارف وتنویر ابنای وطن مشهورن بو معاونت جمعیت کردستان که خادم معارفه تحریراً و شفاهاً دره‌هده بون که به همو نوعی دریغ همت نه‌فرمون . و مخصا به یه‌تی امه‌ی که اشیت کراوه بناوی جمعیت کردستانه‌وه ماکینه‌یکی چاپ جلب بکری وکو له زیره‌وه نوسراوه تعهد و امضایان داوه که معاونت بفرمون .

| | روپیه |
|---|---|
| جناب عبدالکریم بك رئیس جاف | ٤٥٠ |
| جناب احمد مختار بك قائممقام البجه | ٤٥٠ |
| جناب عزت بك عثمان پاشا | ١٠٠ |

و علاوة امه دیسان تعهدیان کرد که له البجه له همو بکزادان خوی خوی مقداریکی کلی اعانه بو ام ماکینهٔ چاپه کرد بکه نه‌وه و بینیرن .

لم خصوصه وه بناو عموم جمعیت کردستانه‌وه عرض تشکر و بیان محمدت له امرا و بکزادان جاف اکین — و امیدمان هیه که‌ شاترا شراف کردستان له‌ام امری خیره‌دا اشتراك بفرمون . تاوجمیتمندان

سلیمانیش که تعهدیان بو ام اعانه‌یه فرموه‌ له امه و پاش دنوسری

بانك کردستان

مأمه ران انکلیز

وکو بیستومانه مأمو ران و هیئت عسکری انکلیز له سلیمانیه وه چون بو کرکوك نازانین فکریان چلونه .

بانك کردستان

من پریشان یار کووتم

عمریکه سیه روز و پریشان کووتم
آشفته وکو طرهٔ خوبان کووتم

عمریکه که روزم به مثل وك شوه زنگه
حسرت زدهٔ شام غریبان کووتم

عمریکه له زندان جنونا که وکو شیت
پابند غزالان اسیران کووتم

عمریکه له کنج قفس فرقت کلدا
وك بلبل دلخسته غزلخوان کووتم

عمریکه له‌دوی محمل لیلی وکو مجنون
خوم لیره و دل ویل بیابان کووتم

عمریکه له‌بو کشتن دجال حسودان
هر منتظر عیسیٔ دوران کووتم

عمریکه دنالم به غم تووه له کرکوك
دایم وکو نی سینه پر افغان کووتم

ایشم همو گریانه وکو هور بهاری
بی صرف دم غنچهٔ خندان کووتم

بیویسته وکو قمریٔ آواره له‌کلشن
سرگشته دل سرو خرامان کووتم

پروانه صفت مضطربم کل شو آخو
کی پرتو ادا شمع شبستان کووتم

کی بی که له اوفق عربستانه‌وه روزی
هلی کل حورشید درخشان کووتم

وانی‌مکه دوورم له‌تو ای صاحب خاتم
هر هدهده کی بزم سلیمان کووتم

خاقینه لبر کوهر تاج سر کرده
قربان محیط عربستان کووتم

هرچن وکو بیژن که له زندان فراقام
بالله به تمای رستم دستان کووتم

عاجز به [بیخود] که اشالله وکو یعقوب
نزدیکه وصال مه کنعان کووتم

بیخود

اعلان رسمی

معلومتان بی کردستان روزی لی بووه حکومت بریتانیا له ممالك خویا اعلانی کردوه بقرار اوروپا ادارهٔ مستقله کردستان تودیع به‌جناب شیخ محمود پاش کردوه و به‌نیابت جناب شیخ قادر افندی تعیین کردوه و بو تحکیم حدود که کفری و کرکوك و هولیره لثبت کراوه . بوامه همو کردی لازمه شادی و اعلان آزادی بکا .

عبد القادر

تشریف رؤسای جاف

بو بعضی مذاکره رؤسای محترمهٔ جاف به استقبالیك بشرف و به تفخیم وارد سلیمانی بون . خدای تعالی له ناو همو عشایر دا ذوات وا منور و به تدبیر زیاد بکا .

بانگ کردستان

انك کردو ا ناوی کردستان آوا کردوه
ناویا فو ناوی عمومی ایسته داوا کردوه
آفرین بو خوتو بو بانکی که‌دات لم عالمه
لشکری شکا نو عقلی احیا کردوه
بو معارف خادمه مخدومی ملك و ملته
ژنکی قلب مؤمنینیشی مصفا کردوه
صاخدا بشنیره وه بو قوم کرد بی کسان
او کسهٔ غنچهٔ امید مات وا کردوه
بوامیدی وصلی اوشاهه (وژنه) منتظر
هر به یاد او برینی خوی مداوا کردوه

له‌چاپخانهٔ حکومت له‌سلیمانی چاپ کرا

صاحب امتیاز و مدیر مسئول
و سرمحرر
مصطفی پاشا

محرر کردی و فارسی
علی کمال و م نوری

# بانگ کردستان

اعلانات بدیریك
۳ آنه ده سیتریت

بو ههو شتیك مراجعت
به صاحب امتیاز اکری

بو حد شهر ولو بدل آبونه
۳ مانك دو ٦ مانك چوار
سالیکی ۸ روپیه یه

بوخارج اجرت بوسطه
علاوه ده کری

(زمان گورزو رم رابوردو ایستا پالوان علمه)
(سلاح دسته صنعت بارقهٔ تیغ وسنان علمه)

تاریخ انتشار
۲ آغستوس ۱۹۲۲
سلیمانی

علمی ، اجتماعی ، ادبی ، فنته یکی حر و سربست ملی یه
هفته جاریك دردچی

نسخه یکی به ۲ آنه دەفروشری

سال ۱ ژماره ۷ [جمعه] ۳۰ محرم ۱۳٤۱ ۲۲ ایلول ۱۹۲۲

مابعد سرمقاله نسخهٔ پیشو

روژی چوارم که روژی شمبه بونه طرف جناب رئیس مجلس ملی جلالتماب شیخ عبدالقادر افندی وه بوخبر ورگرتن له جناب شیخ محمودافندی لبراوه‌ی که خط تلغراف سلیمانی ، چمچمال وکرکوك تخریب کرابو به اوتوموبیل جناب سیداحمد افندی هنجیره بو کرکوك روانه کرا . ام ذاته چونکه له نظرهموندیشه‌وه معروف وناسراو ومحترمه به سلامتی گیشته کرکوك .

روژی شمم جناب سید محمد افندی رئیس جباری لەگل اتباع خویان له چمچالەوه و جناب محمد آغای کوری علی آغای پشدر له قلادزەوه تشریفیان هاته سلیمانی . هەوان له طرف جناب شیخه‌وه مظهر التفات و اعزاز بون . روژ هفتم که روژ دوشمبه بو بگزاده‌کان هموند به وسیلهٔ او مأموریتانەوه که له طرف جناب شیخه‌وه بویان تخصیص کرابو رویشتنەوه بو قضای چمچال و سورطاش . امه و مأموریتیان

لەپاشا دنوسری .

روژهشتم جناب سیداحمد افندی هنجیره له کرکوك به اوتوموبیل کرابووه بوسلیمانی و امخبراتەی هینا :

« جناب شیخ محمودافندی لەکویەوه حرکتی رسماً تعین کردوه و انکلیسه‌کانیش که له سلیمانی رویون له کرکوك کرد بونه وه و آسایش و امنیت کرکوکی حکایه ده‌کرد . و اواقصانه‌ی که انکلیسه‌کان لی‌یان پرسی بو نقلی دفرمو . »

جناب شیخ عبدالقادر افندی بو ری ندان به احوال بی‌معنا و محافظهٔ انتظام شار امری فرموبو که کس به سلاحەوه به شاردا نه‌گری لەسر ام امره عسکر له عشایر و اهالی هرکسیکیان به سلاحەوه بکرتایه سلاحه‌کیان لی دسند و خنجریش بووایه یا دیان شکاند یا دیان هینا تسلیم به آمری خویان دکرد .

بم تشبثاتانه حقیقتاً انتظام مملکت مشهود و بو بعضی مقاصد جاهلانه راه فرصت مسدود بو .

سادات برزنجیه‌یش که تشریفیان هاتبو بو خذمت جناب شیخ اوانهٔ که لازم بون هریکی به ماموریتی تلطیف وتعیین کران .

بو محافظهٔ کاروان و ریگای بغداد شیخان تیار و جناب شیخ عبدالرحمن دارآغا مأمور کران .

حقیقتاً ماموریتی ام ذاتانه به‌جی و بو عموم موجب مسرت بو ام چند شوانه به واسطهٔ سواران خوی بو محافظهٔ آسایش اطراف شار همت و غیرت جناب شیخ مصطفی افندی کوری شیخ عبدالقادر افندی سنکاو انکار ناکری .

روزیك له پاش رویشتنی انکلیسه‌کان له سلیمانی بو تحقیق شایعهٔ هاتنی عسکر ترك که له‌دم چند کسیکدا دورانی‌ده‌کرد جلالتماب شیخ قادر افندی عبدالله آغای معتمد خویان بو طرف سورطاش و دوکان ناردبو روزی ۳شمبه عودتی کرده‌وه و تکذیب ارهمو حوادثانه که‌لمقصد له‌طرف بعض‌اشخاصه‌وه تصنیع و اعظام کرابو دیکرد .

و بنا له غزتهٔ نجمه له کرکوکه‌وه و غزتهٔ بغدادیش تخلیه کردن سلیمانی له‌طرف انکلیسه‌وه معلوم بو که کردان وقت استفاده‌یان و بو کوشش استقلال ملی یان هاتوه‌وه لبرامه به تنسیب وجوه و اعضایان مجلس وکو بیداغیك که‌له پیش وقعهٔ جناب‌شیخ محمود افندی دا موجود بوه‌وه هر اونوعه احضار و له‌مواقع لازمه دا هل بدری . بنا برین روز ۱۵ ایلول ۳۳۸ پاش نو یژی جمعه له‌حوش مزکوت کوره‌دا عساکر موجوده و شاکردان مکتب و اشراف و وجوه اهالی مملکت و رؤسای موجودهٔ عشایر صف بستهٔ احترام بون له‌زیر بیداغه‌کان ملی کردستان که هلکرابون بعض ادعیهٔ خیریه و نطق خویرایه‌وه و به پو احترامه له‌سر دوایر حکومت و قشلهٔ عسکری بیداغه‌کان به تعظیماتیکی لازمه نصب کران . له پاش سلام و دعا جناب شیخ باکال تعظیم و تفخیم بو دولتخانه‌ی خویان که‌خانقهٔ قدس حضرت کاك احمد و قدس سره عودتی فرموه‌وه له‌سرامه‌یش طوپ انداخت کرا بو اعلان مسروریت له زیر بیداغه‌کان دا له‌طرف عساکره‌وه له کل عهد و پیمان صداقت چند دست و یژیك تفنك کرا خدا له کردستانی مبارك بکات .

---

جناب احمدبك کوری مرحوم توفیق باشا که‌ذ تیکی منور و نجیب و له همو خصوصه‌وه شایان امنیت و اعتماده و خزایتیشی له کل رؤسای محترمهٔ پشدر هیه له طرف جناب جلالتماب شیخ قادر افندی‌یه‌وه به مأموریت مخصوصه بو لای رؤسای مشارالیهم نیرابو روزی ۱۵ ایلول ۳۳۸ عودتی فرمو و وظایفی مودوعه و وجدانیهٔ خوی به حسن صورت ایفا کردوه که تفصیلاتی له نسخهٔ آتیه دا درج اکری .

همای دولتی نیشتو بسر کردا بحمدالله
دعا بو بخت کردان کین دوامی بی بعون الله

بلی روژیکی استقلال هزاران روژتر دبنی
بلی روژیکی آزادی له بو کردان جهان دبنی

اوی کردی نه‌وی هلسی به‌جی بیلی سلیمانی
نماوه وقت دورویی له بو انکلیس وتورانی

ذوات بم بانك کردستان بده‌بانکی به آزادی
که‌روح احمد کاکه بکه‌ین شادان به‌آزادی
ماویتی

**مصطفی پاشا**



## ادبیات کرد

معلوم عامه که قوم نجیب عرب به نور دیانت اسلامیه زوو قسم کورهٔ آسیا، افریقا، اوروپایان روناك کرده‌و

و انقلابيكى گورهٔ دنى‌يان احداث كرد — به رابطهٔ اخوت و عدالت زور اقوام مختلفه‌يان به يكوه ربط و له‌زمانيكى جزئى‌دا وحدتيكى سياسى گورهٔ به هيئت‌يان ايجاد كرد له‌سر ام اساسه متين ومحكمه و له‌ژير بيداخ مقدس خلافت‌دا بنايكى گورهٔ حكومتيان تأسيس كردبو .

له‌بر امه‌يه كه چونكه ديانت مقدسهٔ اسلاميه له عرب‌وه ظهورى كردوه له‌هر خصوصيكوه تقليد عرب كرا و طبيعى ادبيات عرب بو به رهبر حسيات عالم .

امرو له‌سر ارض‌دا هر انواع اقوام اسلاميه ادبياتيان له تأثيرات ادبيات عرب خالى نيه .

ادبيات ترك له زمان سلجوقى‌دا به تقليد كردن زبان عرب بواش بواش ديارى‌دا و له زمان دولت معظمهٔ عثمانى‌دا نشونماى تواوى كرد .

ادبيات كرد له او زمانه‌دا شرقى و اشعارى زور نبووه فقط وكو ( جزبى ) و ( نابى ) زور شاعر و كاتب كوره كورهٔ موجود بون و لبر امه‌ى كه‌عرب ، فارس ، تورك دورى گرتبون به‌مجبورى اكثر آثاريان عربى ، فارسى ، توركى بووه .

چه له‌زمان خلافت عباسيه‌دا وچه له‌پاشانا له‌زمان حكومات و امارات كردى‌دا له‌بر امه كه وقته‌كان زور تيكل و پيكل بووه ادبيات كردى به صورتيكى باش ظاهر نبووه . زور باش ورد بينه‌وه ديبين كه ادبيات كرد سه چوار عصر منتظمى رابوواردووه .

له ازمنهٔ مختلفه‌دا ( احمدخان ) ( نالى ) ( سالم ) ( كردى ) (حريق ) ( حاجى قادر ) ( خالص ) ( شيخ رضا ) ( مولوى ) ( وفائى ) و زور شاعر و اديب مشهور كرد پيكهيشتوه كه آثار امانه انشاالله بره به معاونت و همت حضرت حاكم كردستان طبع و نشر دكريت .

علی كمال

..

صورت تلغرافنامه‌ى كه جناب شيخ عبد الكريم افندى بو خدمت جناب جلالتماب شيخ عبد القادر افندى ناردوه :

بو جناب شيخ عبد الكريم

يوم چوارشمبه　　　له كفرى ١٣ ايلول ٣٣٨

امرو شيخ محمود و شيخ غريب ده‌كنه بغداد به اولين فرصت بو كفرى حركت ده‌كن . بلام له‌پيش بزوتن بو بعضى ايش لازمه مندوب السامى مشاورهٔى له‌كل بكات هتا خبرى ترتان بو انيرم انتظاريتان له كفرى پيويسته . هيچ‌وختيك شيخ محمود بو كفرى حركت ده‌كات خبرتان بو انيرم .

حاكم سياسى
ميجر كولدسميث

---

## همت عالى محمودى

جناب جلالتماب حضرت شيخ محمود افندى دام اجلاله كه له كويت بو اول نسخهٔ بانك كردستانيان بو ناردبو له كل كيشتنى ام نسخه يه به خذمتى دوصد روبيه بو اداره‌خانهٔ غزته‌كان به تلغراف حوالهٔ فرمو بو ايه بو ام حركت عليجنابانه‌يه له اداى تشكر عاجزين له ديار بعيد و غربتدايش بو ابذال همت عالى درحق به وطن و كردان و بو نشر معارف له كردستاندا بيدريغى لطف و احسان هر لايق شأن حضرت محموده كه ام ذاته به سبب حسن خلق و متانت فكرى له نظر همو كرداندا محترم و محبوبه خدادوامى عمرى بدا و به‌زودى

بە وجودی مبارکی چراغ خاندانی احمدی لە کردستاندا روشن تر بکا .

..

## قصەی حکیمانە

لەذاتیکی عارفیان پرسی معنی حیا چیە - فرموی معنی حیا اوەیە کە تماشای خوت بکی و لە عیب خلق چاو بقوچینی —

---

عارفان متفقن لەسر امە کە قصەی بی موقع بیدنگی یە و بی دنگی بی موقع هرزەیی یە — کەوەابو انسان دەبی بە قدر ضرورت قصە بکا و گوهری زیاد بە بی احتیاج صرف نکات —

---

طالعدار اوەیە کەخواردی و بردی ، بدبخت اوەیە کە مرد و بجیهیشت —

---

پارە و مال دنیا بو آسایش عمرە — نەوك عمر بو کو کردنەوەی مالە —

---

بە قصەی دشمن تفرە مخو ، مرایی پیاوی ریاکار مکە کوی — اوداوی فیل ایتەوە ام دوکان طمع اکاتەوە —

...

شرلەکل شیر کردن ، دست بە تیغا مالین کاری پیاوی عاقل نیە —

علی کمال

## روشتن

لە بکزادان جاف جناب حسین بك کوری حسن بك و حمید بك و احمد مختار بك و محمد بك فتاح بك و جمال بك کوری جمیل بك و احمد بك کوری محمد بك کە بو بعضی مذاکرە لە طرف جناب جلالتماب شیخ عبدالقادر افندی یەوە طلب کرابون بو سلیمانی لە پاش اوەی کە عائد بە خدمت وطن لە مذاکرات مهمەدا اتفاق و موفقیت حاصل بو روژ دوشمبەی رابوردو تشریفیان کرایەوە بو الیجە خدا حافظیان بی .

بانگ کردستان

---

معارفە کە بلندی ددا بە قوم هزار
جهالتە کە وکا محوی سلسلەی تاتار

فنون و علمە کوا بوتە باعث اقبال
جهالت و حسدە بوتە منشأ ادبار

برادران و رفیقان خوم مبن غافل
لە تربیە و ادب و علم و صنعتیکی بکار

بە جوهری کە هتە لامدە لە مات خوت
نفاق ویدە بی ژنگی مرد جوهردار

وطن وطن وکو کو تری کوترە باریکە
بیینە وردی زبان و دلت بە لیل نهار

بە مال و دولت دنیا منازە ای مغرور
بنای مکتب وبردی حسابە روژ شمار

حیات ایمە حوالەی سخای تشرافە
کە کورە لطفی نبی قریبەمر سفیل وصغار

شاگرد مکتب
فائق : زیور



## روشتن

بنا بە امری کە لە کفری یەوە لە طرف حضرت حکمدار کردستان شیخ محمود افندی یەوە هاتبوەوە بو بعضی مذاکرەی ایش و کار کردستان شوی ۳ شمبە ۱۹ ایلول ۹۲۲ جناب حاجی مصطفی پاشا و احمد بك توفیق بك ، محمد آغای عبدالرحمن آغا ، عزت بك عثمان پاشا و ابراهیم افندی ضابط عسکری بە اتوموبیل تشریفاتی حرکتی کرد بو کفری . دعای موفقیتیان اەکین .

بانگ کردستان

## یونانیەکان ازمیریان تخلیه کرد

لوندره ١٠ . ایلول ٩٢٢ : له ازمیر دا ١١ ی ئه یلول هاتی هات مالکینیان تسلیم به قونسلوسه‌کانی ... کرد . قونسلوسه‌کان له پاش کردبونه‌وه و مذکره بو اوه که له حال سکونتدا عسکر ترك داخل مملکت بی تافر قیان بو مصطفی کمال پاشا نوسی . و بم نوعه هتا ترکه‌کان داخل مملکت بون انضباط و آسایش له طرف مأمورین و ضابطان فرنسه ، بریتانیا و امریقاوه محافظه کراوه .

آتینه ١٠ منه : یونانیه‌کان بروسه‌یان تخلیه کرد بو ( مدانیه ) کرانه دواوه .

پارس ٨ منه : او تالانه که اوردوی مظفری ترك له یونانی گرتوه ( ٧٠٠ ) طوپ گوره ( ١١ ) طیاره ( ٢٠٠٠ ) تفنگی ماکینه‌لی‌یه .

لوندره ٦ منه : استانبول بنا له معلوماتی که له منبعی کالیه‌وه وری‌گرتوه : ترکه‌کان نازللی ، صوما آیدین و بعضی جیگای تریان گرتووه‌ته‌وه — و له ٢ ایلولدا تنها له جبهه‌یکدا ٤٠٠ ضابط و ١٠٠٠٠ نفریان اسیر کردوه .

### قرال قسطنطین فراری کردوه

( شرکت آژانس رویتر ) له مخابر پارسه‌وه معلوماتی ورگرتوه که قرال قسطنطین یونانستانی ترك بو سمتی مجهول فراری کردووه .

---

[بانك كردستان] ك توركچه قسمی :

سلیمانیه‌لی میرالای مصطفی پاشا حضرتلرینك [حقیقت کردستان] نام اثری تفرقه صورتیله درج اولنور .

### حقیقت کردستان

کرد و کردستانك حقایقنی آکلامق ایستیانلر هر ذات و بالخاصه هر کرد ایچون اوقومق لازمدر بو کتابده اولان دلائل و معانی ادله حکمیات و مطالعات توارخ اچنده ده دلیلی بولورکرد آسانك غیر ... اولانلر صدین و تحسین ایده جکنه شبهه یوقدر .

#### مقدمه

ارباب علم و عرفانه مخفی اولمدیغی اوزره خلقت عالم ایچون مبدئی بر تاریخ مفقود و تواریخ موجوده ده و اقوام مختلفه روایات و خرافاتنده دخی بو بابده موثوق دلائل و براهین غیر موجوددر علم الارض متتبعلرینك استدلالات کیه‌لرینه و بعض برلرده حفریاتك ویرمش اولدیغی نتایجه نظراً سطح ارض پك چوق و عظیم تحولات و تأثیراته معروض قالمش و دوی ارضده عمومی ویا خصوصی بر طوفان وقوعی دخی مرتبه ثبوته وارمشدر . تحولات و تأثیرات مذکوره‌نك کیفیت و صورت حصولی قطعاً نظر تدقیقدن گچرلدیکی تقدیرده کرهٔ ارضك پك عتیق ایدوکی تمامیله اولور ایسه‌ده نوع بنی بشرك بو کره اوزرنده نه وجهله و نه زمان وجوده گلمش اولدیغی و ابوالبشر دیدیکمز حضرت آدمك قاچنجی آدم اولوب قاچ بیك ویا قاچ ملیون سنه اول مهدارای ظهور اولدیغنی آکلامق علم بشرك استطاعتی خارجنده کورلمکده در .

شوقدرکه ابنای بشرك کیت کیده تکثرلرندنشئی جمله مدنك برده مجتمعاً یشاملری صعوبتی یاخود آرالرنده اختلافاتك تحدثی حسبیله دور اولده کومه کومه اطرافه طاغیلوب هر جماعت کندولرنجه بعض الفاظ و کلمات قوللانه‌رق مرور زمانله خصوصی بر لسانه مالك اولمشلردر .

اقلیملرك مختلف نوع بنی بشرك رنك وسیمالرینه ترکب و تشکل اعضاسنه تأثیری عیان اولدیغی کبی لسانلرك لهجه‌لری اوزرینه دخی تأثیری جای افکار

اولدیغندن مذکور اختلافات و تشعب السنه کیفیتی
اقوام ماضیه و حاضره‌نك تشعب وتشکلنه یکانه واسطه
اولمش بولندیغنه حکم اولنه بیلور. اساساً نسل واحدن
اولدیغنه شبهه اولمیان ابنای بشرك او یاك تفرقه و
تشعبی مایه سنده محال مختلفه‌ده وجوده کلمش اولان
جماعتلرك یکدیکرندن علامات فارقه‌لری و قومیتلرینك
یادکار ابدیلری اوله‌جق اولان لسان مادرزادی وطول مدتدنبرو
ابا و اجدادینك مأوا و مسکنی اولان وطن اصلیی
مقدس بیلملری برسوق طبیعی وحتی برذوق انسانیدر
کردلر ایسه قدیم زمانلردن وحتی طوفان نوحدنبرو مسکن
و مأوای حالیلرینك متوطن اصلی واریثی اوله‌رق محافظه
ایده‌کلدکلری لسان ملینك برچوق کلمه‌لری زادهٔ طبیعت
اولان الفاظدن مرکب وحتی نظم و نثرده السنهٔ
موجوده‌نك هیان برچوقلرندن دها مستغنی اولدیغندن او
لسانك مزایا و استعدادینه واقف اولان هر حمیتلی
کردك کندی قومیتنه و وطن ارثی وقدیمنه محبتله مربوط
اولمسی وشاید حسب الزمان او وطن مقدسدن بعدا
دوشمش ویاخود یتشدیکی و بیودیکی محیطك اقتضاسی
اوله‌رق او پهلوی لسان شیریننده محروم قالمش اولسه
بیله حسب الحمیه ابا و اجدادینك ، قومیت قدیمنی
آرایوب آرزو ایلمسی وبنابرین هر کردك منسوب
اولدیغی قومك تمادی زمان ایله نیجه شعبانه آیرلمش و
لسانلرینه نه کبی عوارض و تبدلات طاری اولمش و
شعبات و جماعتلرك وجه تسمیه‌لریله موجود حاضر و
سابقنك تخمیناً نه‌دن عبارت بولنمش ایدوکنی بیلمسی
مقتضی ایدوکی کبی برابرجه یشامش و قونشولق
ایتمش اولدیغی اقوام سائره‌دنده خبردار اولمسی ایجاب
ایدر. مابعدی وار

---

له وقتیکا جناب سعید زغلول پاشا که له سرمسئلهٔ
مایت له مصر گرتیان و به حبسی بردیان ایاشا که عودتی
کرده‌وه عربه‌کان و اهالی مصر عموما چون بو استقبالی
وبه سرشان ومرحبیان کرت به او اوعه احترامه داخل
شار بو .

حضرت حکمدار کردستان جناب **شیخ محمود**
**افندی** که لسر عین مسئله گیرا و ۳ سال ونیوه حبسه
ایستا تشریف هیناه‌وه نزدیکه . بزانین ملت کرد به
چه نوعیك استقبالی اکن ؟ و احترامی اکرن ؟ وله حق
مشار الیه به‌چه حس و حرمتیك خویان نشان ادن ؟؟.

---

## اعلان

له محلهٔ درگزین خانویك که به‌خانوی حاجی امین بك
مشهوره و له‌قید اساسدا یك خانو بوه و کراوه به‌دو
خانو به‌طاپو ملکی غفور ومحمد بك کوران حاجی امین بك
وحاجی کاکه حمه کوری حاجی احمده و اطراف اربعه‌ی
به‌طریق عام و به‌خانوی میرزا فرج وحاجی عبدالله و
مفتی و فقی محمود و معروف فقی وسو محدوده چونکه
قابل تقسیم نیه بو ازالهٔ شیوع فروشتنی قرار درایو
له مزایدهٔ اولیه‌دا به ۳٥۰۰ روپیه لسرطالبی تقرری
کردوه احالهٔ موقتهٔ کشیده کرا بناءً علیه له تاریخ ام
اعلانوه تاپانزه روزیتر صدی ۳ ضمائم قبول اکری هر
چی طالبه صدی ده تأمینات مستصحباً مراجعت به
محکمهٔ صلح سلیمانی ومنادی توفیق آغا بکات .

۳ ایلول ۹۲۲ — معاون حاکم منفرد
محمد نجیب

---

۷۹ — ۹۲۲

او خانه که به خانه سوتاو مشهوره و ربعی عائد به
جاف محمود پاشایه له نتیجهٔ مزایدهٔ علنیه‌دا هرچند به
۷۱۰ روپیه لسرطالبی تقرری کردوه چونکه ام بدله
له قیمت محمنه‌ی به درجهٔ وحش نقصانه بموجب مادهٔ
۸۰ قانون اجرا تا یك مانك تکراراً وضع به مزایدهٔ
علنیه کرا هرچه طالبه صدی ده تأمینات مستصحباً
مراجعت به دائرهٔ اجرای سلیمانی و دلال توفیق آغا بکا .

۱۷ ایلول ۳۳۸ — مأمور اجرا : م . وهبی

---

بعضی کتیب مفیدم له بغداوه هیناوه اوانهٔ طالبن
مراجعت بفرموون نوع وفیاتی عرض ان اکری وای بینن
له قیصری نقیب عطار : محمد آغا

---

له چاپخانهٔ حکومت له سلیمانی چاپ کرا

صاحب امتیاز و مدیر مسئول
و سر محرر
مصطفی پاشا

اعلانات بدیریت
۳ آنه نه سطریت

بو همو شتیك مراجعت
به صاحب امتیاز اکری

# بانگ کردستان

به کردی و فارسی
... کل ...

بو ... ... آبونه
۳ ... ۶ ... جوار
... ۸ ...

بوخارج اجرت بوسطه
علاوه ده‌کری

( زمان گورزو رم رابوردو ایستا پالوان علمه )
( سلاح دسته صنعت بارقهٔ تیغ وسنان علمه )

تاریخ انتشار
۲ آغستوس ۱۹۲۲

علمی ، اجتماعی ، ادبی ، غزته‌یکی حر و سربست ملی‌یه
هفته‌ جاریك دردچی
نسخه‌یکی به ۲ آنه ده‌فروشری
سالیانی

سال ۱ ژماره ۸ [ جمعه ] ۷ صفر ۱۳۴۱ ۲۹ ایلول ۱۹۲۲

« دولت همه ز اتفاق خیزد »

« بیدولتی از نفاق خیزد »

امرو له‌ناو ملت ایمه‌دا نفاق به درجه‌یك حکمفرمایه برا له‌گل برا ، باوك له‌گل اولاد ، حاصلی کس له‌گل کسدا له‌قصه ، نه‌فکردا یك ناکه‌ون .

به محضی امه شخصیك شخصیکی خوش ناوی ایتر له‌رق او یا هزار قصهٔ باش بکا ، یا بو منفعت ملت روحی خوی فدا بکا هیچ فایدهٔ نیه له نظریا ئیزیی و او فکره باشهٔ له‌نظری جهلا و عوامدا به نوعیکی خراپ ادا ده‌کات و نشان به خلق ادا .

مثلا : امرو همو کس ازانی و حتی جهلایش فرق به ده‌کن که حاکمی له‌محکومی چاکتره له گل امیش دا بعض کس شك ایم به محضی امه رق له کسیکه و اوکسه حظ به محکومی ناکات و دیه‌ویت آزاد و حر له‌ژیر اداره‌ی خوی‌یا بژی له‌رق او کسه ام حظ اکات ملته‌کی ... محکوم و مظلوم بی .

ای قوم کرد . بوچی خرابه امرو له‌ژیر بیداغ خومانا به سربستی بژین و نایلی حقوق مایهٔ خومان بین .

ایمه نالین ببین به دشمن حکومت اسلام ایمه الیین جاری با بو خومان موجودیتیك . ناویك پیدا بکین و له‌ژیر بیداغی کردا کرد بیینه وه اوسا که‌بوین به شتیك و دسمان گیشته حکومت اسلام متفقاً و ترقی اسلامیت دست بده‌ینه دست او حکومتی اسلامیه‌یه که لابیت به دراوسیمان .

لم وقته‌دا ام فرصته که بو قوم کرد هلکوتووه ملته‌کانتر به فداکردن صد هزاران نفوس بویان هل نکوتووه و هل ناکوی — له‌گل امه‌یشدا ایمه له‌بر نفاق و شقاق خومان اغفال اکین هر دلین ( فلان هات ، فیسار رویشت ) بوین به کرده‌کی له هردو جژنان بو .

عجبا اگر همو وکو برا دست بدینه دس یك واز له نفاق و حسد بهینین ، بو ترقی و تعالی خومان تی بکوشین و محافظهٔ خومان بکین لمه باشتر نیه که به درو و دلسه ام وقته عزیزه‌ی خومان ضایع بکین و له نظر

يار و اغياردا بدناو و مهتوك و رسوا ببين و بە واسطة
اميشەوە كە ئەم فرصتە گورەيە لە دس ددين اولاد و
احفادمان كە بە محكومى اميندەوە تنعيمان بكن .

على كمال

---

بە مناسبتى اوەوە كە جناب جلالتمآب رئيس مجلس
ملى كردستان شيخ عبدالقادر افندى نشانيكى هلال
و استيرة لە آلتون درست كردوە و لە سر هلالەكە
عبارة [فدای ملت] لى هلكنراوە و بە بازوى مباركيدا
كرتوە ام چند شعرە بيژراوە :

فدات بم اى فداى ملت اى سردار كردستان
وليعهد همايون طالع خنكار كردستان

بە انفاس مسيح آسا علاج حاجات بخشى
بە داية بى كس بيچارة بيمار كردستان

وكو باران رحمت لطف عامت فيض بخشايە
بژى اى واسطة نشونماى كلذاو كردستان

بە زر كفت طلا ناوت لمولادرج ابى تا حشر
لە تاريخا بە عنوان سپە سالار كردستان

اكر بيشمكرن زمرة مخالف پيت الهم احجا
هز بر غالب دين ، حيدر كرار كردستان

اوة بدخواهتە با قر بە سرداكا بە نوميدى
وجودى تويە فخر فرقة احرار كردستان

دخيلم فرصتە هنكام سعى و جهدە تيكوشە
بە دل بو انتظام ملك بو اعمار كردستان

سليمانى : على كمال

..

هر چند ورد ابمە وە تى افكرم كوى اكرم بە ابينم
نە ابى ئەم شخصى چە جاهل چە عالم بە حسياتيكى
متين ملى محسس بى . مرضا بشسى سبب بوة كە ام
حسيانە اساسيكى محكم وەوخيكى متينى نيە بە حزئى
انقلابيكى موقتى معكوساً مبدل ابى ( طبقة عوام ) مملوءە
كەم طبقە يە همو وقت و زمانى تابع جريانيكى طبيعين
يعنى حكومتيكى بە شدت بوبى بو اوة كە اشقيا و دزو
جردە ضربە لە كسابتيان ندا لەصورت دائميا دعاى
موفقيت او حكومتة كراوه ، لەعين حالدا اكر او حكومتە
توری مقابل بە خارج نفوذى تيژنى كردبى او وقتە
غيبت حكومت و دعاى موفقيتى او كە كراوە كە
كاروانى تا صلاحيەروانە كردەوامانە حقيانە (طبقة منور)
بو ام طبقەيە زور تعجب اكم كە هريكى بە نسبت
خويە وەوكم زورلە پينج سالەوە هتادە دوانزە سال لە عليه
حربيە لە حقوق تحصيليان ديوە لە تشكلات حكومت
باخبر و بە حسيات مليە متحسس و دماغيكى مساعد و
تربيە ديدەيان بو محاكمات سياسى ، اقتصادى و اجتماعى
و وضعيت عسكرى هر حكومتى هيە لە كل اشدا
فكرى كەامرو بو خويان قرار ادەن صبحينى لە بريان
اچيتەوە هاوفكريكى دوينيان بو قصە كردن ئەوپەرە
تنشتيەوە كە تماشا اكا فكرەكى دوينى تماوه كرى حوباوى
چى — فكرى امروى لە كل هينى دوينى دا (آسمان و
ريسمانە ) كورەتو كابراكەى دوينيت نە والله و بالله اونم
ام قور بسەرەش هلدەسى و اروا اليست ق ناكا با
من دروزن بم .

زور پياوى وام ديوە كە جاه و جلالى حرمت
و عزتى بە حكومت انكليسەوە بوە و هيچيتر . امرو
لە عليه او لەاهى يكيكترە و شخصى واشم ديوە مبادى
دشمن حكومت ترك بوە كچى امرو براى هاوبشتنى
انسانى وايشم چاو پى كوتوە كە صرف خادم ملت بو
و بو ترق و تعالى قومەكى خوى سعى كردوە و
ويستويتى كە قومەكى بى بە پياو و لە تاريخ عالمدا
موجوديتى اثبات بكا اويش ناشكرى ناايم امرو

نوعیکی تره . بیجگه لهمانه قسمی بی طرفیش له سابق خواوه زوره . امه زور عیبه مه که ایمه یستومانه منهادی بو ترقی و تعالی خوی هرسی کردوه حظی له محکومی نکردوه محاکات سیاسی تاریخ امانه زور چاك اثبات اکا . الهم اصلح احوالنا .

م . نوری

∴

بو ادیب محترم شیخ نوری افندی

شایان حیرت بهجسارتیکی مدنیه وه همو یرینه‌ی ایمه‌ت سارپژ کرد . اسقام وجدان و اقسام فکرت له ایمه گیاند معایب و نقصانیتی ایمه‌ت بتواوی نشاندا . تمنی اکم مقالات مفیده و حرکات واقعهٔ جنابتان بی به علاجیکی کافی بو ایمه .

تماشا اکه جاری له وژاندن خوینی دونی دا موفق نبوین . چونکه اوی ایمه‌ی خسته خوی بی هوشیه وه . فکران ، روحمان ایمه دائما بو ملیت . خومان به شیریکی رق هلساو تماشا اکرد . امش بو اسطهٔ یکیتی افکار تمیم نی کیشتووه‌بو .

متأسفانه به خیالیکی موهوم سرخوشان جهل‌آمال مقدسهٔ ملیه‌مان تایه ژیرپی و فکر داوا کردنی او حقوقه مشروعه‌یه‌مان بلاو کردوه . جنابیشتان له اکثر مقالات به نصایحیکی خیرخواهانه عین حقیقتتان اظهار کردوه و تلون افکارتان معلوم کردبو ون کردنی ملیت به نظر وضعیت جغرافیاوه لام زور زحمته .

(اوی مرن لبی انزمام تفرقه و بلاو بونه وه‌ی فکربو) وا اصف خومن ملیتمان حریکه به شرارهٔ آگری جهل اسوتی . ایانه‌وی بار تتانتی شأن و شرفی اجدادمان به شأنی غیرمتحملی ایمه هلکرن که امش محاله‌امروا ایمه له حالتی زیان و سقوطیکی ابدیاین له تاریخا چاوم پی کوتوه . مصر ، فنیکه ، کلدان ، عراقی ، عرب و یونانی یادکار زکایان چنده فقط مدنیتی امانه هرچند مردوه بلام دستگاهی مدنیتیان ایستاش باقیه ، اما ایمه بلا قید و شرط نك لناو بردن مدنیت بلکو امانه‌وی ملیتمان دفن بکین .

حیات ملیت ۳ چوار ساله ایمه ابژئین بلام لم کرده نه حیات نه ممات تی‌ناکا . ژین ، خواردن و راستراحت . مردن اجل موعود نیه . آخ له هموما قصر امل ، قصر نظر موجوده ، مساعدات حالیه تماشا ناکین . ضرب المثل هیٔی امرو به هیٔی سبینی مسلکی اصلیمانه . طبقات پیشومان تفتیش و استنطاق ناکین .

باکتر داینشتن ، هلسان ، خواردن و خواردنه‌وه و نوستنمان لا له همو شتی چاکتره .

عجبا تی‌گیشتووه‌کان ازان که له حیات محیط و له افکار طبقهٔ کردا حصه‌یکی مسئولیتیان هیه .

ماوتی
کردیك

مدافعهٔ استامول و کلیبولی

پارس ۱۲ ایلول - له بیاننامه‌یکی شبه رسمی دا به ناظرخارجیهٔ فرانسه مذکره‌یك واصل بوه و له ام مذکره‌یه دا به مساعدهٔ دولته کان ائتلاف حکومتی بریتانیا مدافعهٔ استانبول و کلیبولی اکات ) تبلغ کراوه .

حکومت فرانسه احتمالیه روژی ۳ شنبه جوابی او مذکره‌یه بداته‌وه -- دیسان له‌مآلی او مذکره‌یه‌مسئلهٔ مراسمتی بوغاز کان اوندهٔ که حکومت بریتانیای خستوه‌ته فکره‌وه حکومت فرانسه‌یش خستوه‌ته فکر و خیاله‌وه --

سمکو

بیستمان له کاغذیك که له بانه وه هاتوه جناب ( سمکو ) هتا ایستا دو دفعه لهگل عسکر عجم مصادمه‌ی واقع بوه و هردو دفعه که تلفاتیکی زوری له عجمه‌کان داوه ، به موفقیت گراوه‌ته‌وه بو جاری .

لوئيد جورج اهچيت بو جنوه

لوندره ١٢ منه له ٢٩ همى ام مانكه‌دا لويد جورج لبر امه‌ى كه له خصوص حالت اقتصاديهٔ عموميه‌وه بيانات مدهشى بدات رويشتنى بو جنوه انتظار ده‌كريت .

---

لوندره ١٢ منه هتاوكو احوال حربيه به تواوى معلوم نه‌بيت قونفراس صلح ونديك كه كرد بونه‌وه‌ى مصممه بو امهٔ كه عائد به مسائل سياسيه هيچ فكريك اشان نه‌دات دولته‌كان ائتلاف قراريان داوه .

---

امير زيد

براى بچوكى حضرت ملك فيصل عراق كه ناوى امير زيده وكو استخبار كراوه تشريفى كيشتوه‌ته بغداد .

مژده بو عرق خوره‌كان

به امرى جناب رئيس مجلس ملى كردستان خواردنه‌وهٔ عرق و ساير مسكرات ممنوعه . هركس عرق بخواته‌وه وياخو عرق و مسكرات سائره له خارجه‌وه جلب بكات به شدت تجزيه و حبس اكرى و اگر مامور حكومت بيت عزليش اكرى .

بانك كردستانه

---

خوش آمدى حضرت شيخ محمود
دامه اجلاله

شكرلله مژده‌بى وا نورى ايمان هاته‌وه
لرشد اولاد حيدر شير يزدان هاته‌وه

هر وكو يوسف له زندان اسارت هاته‌وه
شاه مصره صد شكر وارو به كنعان هاته‌وه

صف به صف زمرهٔ ملايك دين به استقباله‌وه
بانك اكن وا مظهر الطاف رحمان هاته‌وه

عرض تبريكات اكن جن وملايك يك به يك
زمزمهٔ خير القدومه شاه دوران هاته‌وه

شمشمه كويره له داخا خوى له قورنى حقيقى
شو نما ظلمت بمرچو مهر رخشان هاته‌وه

خاتم حكمى له دس حيلهٔ شياطين درنهات
تا جناب آصف ملكى سليمان هاته‌وه

جام مى سابينه كردش ساقيا توبى خدا
مدتيكه دل حزينم جان جانان هاته‌وه

مطرب خوش لهجه كوا دنكى رباب عود و نى
وقت وصله قاتلى عمر رقيبان هاته‌وه

جژنى كردستانه قربان بوقع قربانيه
چون به قربانى نيم وا فخر كردان هاته‌وه

سليمانى : احمد فوزى

§

ميرلوا جناب صديق پاشا

له‌وطن پروران كردستان جناب سعادتماب ميرلوا صديق پاشا كه بينيكه له‌بغداد بووه اجاره بو خدمت وطن و ملت تشريفى هاتوه‌ته‌وه بو سليمانى عرض بخيرهاتن و دعاى موفقيتيان اه‌كين .

تشريف

بيكباشى اركان حرب جناب توفيق وهبى بك و بيكباشى خالد سعيد بك و يوزباشى رشيد افندى و ملازم امين افندى ملازم عزيز حكمت افندى و ملازم عبد العزيز افندى و ملازم رواندزلى امين افندى له بغداده‌وه روزى دوشمبه ٢٥ ايلول ٩٢٢ تشريفيان هيناوه بو سليمانى عرض بخيرهاتنيان اكين .

بانك كردستان

عودت

لە اشراف و متحیزانی سلیمانی جناب محمد آغای عبدالرحمن آغا و احمد بك توفیق بك و عزت بك عثمان پاشا و ابراهیم افندی ملازم عسکری کە بە امری حضرت حکمدار کردستان طلب کرابون بو صلاحیه روزی دوشمبه ٢٥ ایلول ٩٢٢ تشریفیان کرایه وه بو سلیمانی .

بانك کردستان

تعیین

لە اذکیای کرد قزاز زاده سعید افندی لە سر تنسیب مجلس ملی کردستان به معلم انکلیسی مکتب سلیمانی تعیین کراوه. تبریك و دعای موفقیتی اکین .

بانك کردستان



قسم فارسی [ بانك کردستان ] :

زادۀ طبع شاعر مادر زاد جناب
مفتی زاده [ محمود بیخود ]

درنعت حضرت خاتم انبیا محمد المصطفی صلی الله علیه وسلم

دبیر پیر خردباز بر گرفت قلم
نوشت نعت رسول خدا شفیع امم
کدام نعت همان کر بدیر بنویسند
شود برهمن از اعجاز شیخ ودیرحرم
کدام نعت همان بر صراط اکر خوانند
شود زبوی مضامین او جحیم ارم
کدام نعت نویسند اکر به لوح مزار
زخاك رقص کنان سر زند بنی آدم
کدام نعت که بر مهد هر که آویزند
شود بمعنی آنا نی الکتاب اعلم
کدام نعت که بام بلند عرفانرا
زعلو معنیش الفاظ او بود سلم
کدام نعت که ضحاك کفر اکر شنود
شود دو مصرعش از بهر مغز او ارقم
کدام نعت کز اعجاز او شود سبحان
اکر چوخامه ببوسد صحیفه اش ابکم
کدام نعت که تسبیح قدسیان شنود
نهند یکدم اکر حرف او بکوش اسم
کدام نعت که ریزد زسر و موز و نی
بهر ریاضی که یك مصرعش کنند رقم
کدام نعت که درد مرا بود درمان
کدام نعت که زخم مرا بود مرهم
چه نعت نعت رسول خدا کدام رسول
که اوست بلبل وحدتسرای باغ قدم
چه نعت نعت شفیع امم کدام شفیع
کز اوست خاطر غمکین مذنبان خرم
مه منیر نبوت [ محمد ] عربی
شه سریر فتوت بدست او خاتم
مهی که داود از چتر ابر سایه بسر
شهی که داود از شهپر سروش خیم
بدرکهش همه سکان آسمان دربان
بحرکهش همه کرو بیان قدس خدم
ستاده کر درباضش چنان صف ملکوت
چو حاجیان که به اطراف کعبۀ اعظم
غبار مقدم او سرمۀ نکاه خرد
سواد اعظم او قبلۀ جباه حکم
فلك فتاده بجوکان عزتش جون کوی
ملك ستاده در ایوان رفعتش چو حشم
حریق شعلۀ بیضای عدل او کسری
غریق لجۀ دریای جود او حاتم
مقام اینفش اعجاز موسی عمران
نسیم دامنش انفاس عیسی مریم

قتاده در قدم او ز ذره تا خورشید
ستاده در حرم او ز مسیح تا آدم
ستوده که نبودی اگر مراد رخش
نخوردی ایزد داور بآفتاب قسم
اگر بعالم امکان نیامدی ذاتش
وجود خلق شدی تا ابد بکتم عدم
ز اوج نعت رفیعش چه دم زنی بخود
که هست پایهٔ معراج او زلوح و قلم

مابعد دارد

§

[ بانگ کردستان ] ك تركجه قسمی

## حقیقت كردستان

مابعد

ایشته ملاحظات مسروده یه بناً كردلرك منسوب اولدقلری قوم نجیب و قدیمك احوالی و وطن اصلیلریله حاوی اولدقلری فرق و قبائل قدیمه‌نك وجه تسمیه‌لرنی و سائرهٔ بیلدیكم قدر تشریح و تفسیر ایده‌رك [ هاوار كردستان ] تسمیه ایلدیكم اشبو رساله یه درجنه جرئت ایلمش ایسه‌مده معروضاتمك مبنی اولدیغی اساسات اوزرینه كرد و كردستان حقنده و دها مفصل مفید معلوماتك اعطا وعلاوه سنی غیور و ذكی كرد برادرلرمدن امید و تمنی ایده‌رك خطالرمه قلمكش عفو و عاطفت اولملرینی نیاز ایلرم و منه التوفیق .

تشرین ثانی سنه ١٣٣٤

### كردلرك منشأ اصلیلری و كردستانك صورت تشكلی

روی زمینده‌كی اقوامك تبلبل السنه‌لری ایله صورت تشعب و انتشارلرینه دائر جهانده مكمل بر تاریخ موجود اولمدیغندن و موجب مراق اولان خصوصات مذكوره‌نك تعمیق و تدقیق اوته ده‌نبری ملل متمدنه متفكرینجه نظر دقته آلنمقده و اله كچیریلان آثار عتیقه‌دن و حتی خرافات و حكایه‌لیدن دخی امارات و دلائل استخراجنه غیرت ایدلمكده‌در .

كردستانك تواریخ موجوده و آثار عتیقه ایله مثبت دلائل و براهین اوزرینه حدود قدیمه‌سنی و بو قومك كچیرمش اولدیغی طوفان انقلاباتی بالاخره كوستریله‌رك اولبابده مقتضی بر قطعه خریطه دخی ربط ایدلمك ایسه‌ده شمدیلك قوم مذكورك تخمینی موجودی ایله مسكون اولدقلری منطقه‌لرك اسامیسنی و بو منطقه‌لرده بولنان كردلرك اهالیٔ اصلیه‌دن اوله‌رق مهاجراً كلمامش اولدقلرینی مدلل مختصر براهین و مطالعات سردیله اكتفا ایدییورم .

قرآن عظیم الشانده صراحت و بعض تواریخ موجوده‌ده دخی مذكور اولدیغی اوزره آسیای صغرا و عراق جهتلرنده طوفانی متعاقب حضرت نوحك سفینه‌سی سنجار منطقه‌سنده كائن جودی — زنكار سلسله‌سنك وسطنده‌كی یوكسك زروه سنجار سكان قدیمی اولان یزیدیلرجه جبل جودیدر . جزیره و زاخو جهتلرنده‌كی اهالینك ادعا و روایات ملیلرینه كوره جزیره قصبه‌سنك شمال شرقیسنده‌كی یوكسك طاغ جودی طاغیدر — طاغنه اوطوردقدنصكره او جوارلری مسكن وماوا اتخاذ او حضرتك اتباعی مرور زمانله تكثر ایده‌رك جزیره و سنجار منطقه‌لرنی اعمار ایتمشلر و احفادندن اولان مادایلر یاخود مادلر قسماً شمدیكی آذربایجانك پهلویجه اصل اسمی اولان آذربایكان و قسماً دخی همدانه قریب آكباتان طرفلرنده تأسیس و توسیع حكومت ایتمشلر و او صره‌لرده بینه احفاد نوحدن اوله‌رق شمدیكی سلیمانیه شهرینك شرقیسنده آرروجه حكومت شكلنده یاشایان آلانلرله برلشوب بیوك بر سلطنت تشكیل ایلمشلردر .

مابعدی وار

له چاپخانهٔ حكومت له سلیمانی چاپ كرا

صاحب امتیاز و مدیر مسئول
و سر محرر
مصطفی پاشا

اعلانات بدیریك
۳ آنە دە سینریت

بو همو شتیك مراجعت
بە صاحب امتیاز اکری

ح. ر کردی و فارسی
[illegible]

بوداخل شهر ولوا بدل آبونە
۳ مانك دو ٦ مانك چوار
سالیکی ۸ روپیە یە

بوخارج اجرت بوسطە
علاوە دەکری

# بانگ کردستان

(زمان کوردی وم رابوردو ایستا پالوان علمە)
(سلاح دستە صنعت بارقهٔ تیغ وسنان علمە)

تاریخ انتشار
۲ آغستوس ۱۹۲۲
سلیمانی

علمی ، اجتماعی ، ادبی ، غزتەیکی حر و سربست ملی یە
هفتة جاریك دەردچی
نسخەیکی بە ۲ آنە دەفروشری

سال ۱ ژمارە ۹ [ یکشنبە ] ۱٦ صفر ۱۳٤۱ ۸ تشرین اول ۱۹۲۲

روزی ۱٦ ایلول ۹۲۲ لە افواه ناسدا دیی... ە
لە سلیمانی دا وکو لە زمان اول حکمداری حضرت
شیخدابو لە مخالفان جمعیتیکی خفیە کە تشکلی کردوە ام
بیداخانە کە هلواسراوە دی هینە خوارە وە وخویان
بیداخیکی مخصوص لە جیکای اوان هل واسن وکویا
بە واسطهٔ قوتیکە وە کە دیت لە شاردا بعض ذوات
معروفە ومنورە اتلاف دکن وعسکری ترکیش کویا
آلای آلای ، فرقە فرقە لە دوکان لە آوی زی پریونەوە
بوبری سورطاش ( کە لە سلیمانی وە دە سعات دورە )
حتی جمعیتیکی مخصوصە یش کە لە میژە مشغولی صنعت
پروپاغاندا (یعنی فروفیل) بو بواستقبال قوماندان عسکر
ترك کە ناوی خوی ناوە [ اوزدمیر پاشا ] نیرراوە و
حتی بوسواربونیشی اسپیکی زورچاك ( فقط نە وکو لە
مال مستقبلەکان بی بە امانتی لە غیرە خوازراوە )
روانە کرابو ودیانوت بودعوت بە ناوی اهل سلیمانی وە
زورکاغذ تصنیع وترتیب و بە دزی یەوە بو جانب او
[illegible] ... دعوتانە غراز
[illegible] ... ور الاحوال لە اولا کس [illegible] و لە
[illegible] راە ناسدا شایعە هبو کویا لە کل ام استقبال و دعوتە
( لیستە ) یعنی دفتریك کە ناوی زور کسانی مستحق بە
کشتن یا بە مال تالان کردن یا بە حبس بازدە سالی
محکوم کردن تیدا نوسرابو دبیژرا. امرو زە روژ ۷ ایلول
۹۲۲ بم نوعە شایعاتە وبو قصە بردن و درو دلسەریك
خستن فرکوەوری دایمی او [illegible] بوماڵان وادوای
دەکرد کس کە لە قدیمە وە بم عادتە فیرنبوبی و نەی دبی
غراز امە کە یاستار بخوینی شتی تری بە خاطرداندەهات
لە طرف وظیفەداران و بالخصوص بە واسطهٔ
سوارکان جناب سیادتماب شیخ مصطفی افندی مح[illegible]م
شیخ عبدالقادر افندی صنکاو وجناب رشادت وشیادتماب
شیخ عبدالکریم افندی زادە شیخ محمد افندی و جناب
شیخ عبدالرحمن داراغا آسایش داخل و اطراف شار
محافظە دەکرا .

فقط لەبر ام تصنیعاتە یعنی هابستن درو و دلسە

و تزویرات معلومه له داخل شاردا ىاخصوص ارباب
ثروت امنیتی دلیان نماو و بو قایم کردنی شتومکیان
به دزیه وه خریك بون . فسبحان الله ! له چه
زمانیکاین به ظاهری افتخار به اسلامیت و مردی
دکین له بر اختلاف افکاریکی بی اهمیت برای دینی
له برای دنی امنیتی نماوه و له مقابل یکتری مشغول
ترتیبات دشمنانه ین .

شوی ۳ شمبه ۱۲ ایلول ۹۲۲ بنا به ارادهیك
که له طرف اشرف جناب جلالتماب حضرت حکمدار
کردستان [ شیخ محمود ] دام شوکته گیشتبو حضرت
شیخ قادر افندی ، مصطفی باشا ، و جنابان عثمان باشا
زاده عزت بك وعبدالرحمن آغا زاده محمد آغا وتوفیق
بك زاده احمد بگی بو ملاقات و استقبال حضرت
حکمدار به اوتوموبیل به ریکای چمچمال و کرکوکدا
روانهی کردن بو صلاحیه .

او جمعیته خفیه یه که له مه و بیش بحثمان کرد کو یاالبرامه
که خبریان بوت حضرت حکمدار شیخ محمود له بغداد
حرکتی فرمو وه و عنقریب تشریف اهینیته وه بو سلیمانی
هرچند ۳ چوار روژ بیدنك بون و له روکردن به
ظاهری فراغتیان کرد فقط روزی ۲٤ ایلول چونکه
حرکت فرمونی حضرت حکمدار معلوم نبو و اوزواتانهش
به امر چوبون بو صلاحیه نهاتنه وه او جمعیته خفیه یه
دو باره شایعه یان خسته شاره وه که کو یا ام هیئته که له
سلیمانی یه وه بو ملاقات و استقبال حضرت حکمدار
چون بو کفری بردویانن بو بغداد و بعضی دیان وت
حبسیان کردون .

و به ناو بازاردا چند کاغذیکیان بلاو کرده وه که
کو یا ام کاغذه له طرف قوماندان عسکر ترکه وه بو اشراف
و معتبران سلیمانی نوسراوه که هیچ خوف نکن همو
اسلامن و ترکیش اسلامه بجی استقبالیان بکهن و
مضبطهیان بنهوی بیان هین بو سلیمانی و له
صورتی کاغذیکدا که او قوماندان ترکه بو جناب
عباس آغای محمود آغای رئیس پشدری نوسیبو تیدا
بیان کرابو : که اگر اهالی سلیمانی به احترام عسکر
ترکیان قبول و استقبال نهکرد به واسطهٔ قوت پشدرهوه
سطوت حکومت ترك نشانیان بده و اگر مصطفی باشا
و همپاکانی حیاً در دست بکری رتبهٔ باشای له مجلس
ملی انقرهدا بوت استینم و له کاغذیکهدا که [ اوزدهمیر
باشا ] بو قوماندان مفرزهکی دوکانی نوسیبو امری
دابو که له سلیمانی ادارهٔ عرفیه بکات ! ! !

لهبر امه که اهالی تیگیشتن ترککان هر وکو پیشو
افکار خون ریشتن و اعدام کردنی کردانیان له دماغدا
ماوه و بلکو زیادی کردوه اکثر له طرفدارهکان ترك
له ترس روح پشیمان بونهوه به دزیهوه امجا له علیه
ترك ادوان فقط لهبر امه که دیان وت سمانیکی تر دگنه
شار . جرئتیان ندهکرد به آشکار له علیهیان بین .

روزی ۲۵ ایلول ۹۲۲ : باش نیوهرو جنابان
عزت بك عثمان باشا احمد بك توفیق بك و محمد آغای
عبدالرحمن آغا که چوبون بو صلاحیه به اوتوموبیل
گرانهوه داخل سلیمانی بون و له کل اواندا بعضی امرا
و ضابطان کرد که له بغداد بون و اسمیان له نسخهی
پیشودا نوسرابو اوانیش به امر حکمدار تشریفیان
هینایهوه بو سلیمانی و خبریاندا که حضرت حکمدار
به سواری اسپ له ریکای قادرکرمهوه تشریفی دچی
بو داریکلی له سر امه درو و دهلسه تازهیشی
کوزایهوه .

امجا طرف طرف له هولایکهوه و حتی اوانهیش
که ام درو و دهلسهیان ترتیب و بلاو دکردهوه دسیان

کرد به علیهدار ترك و اظهاری دوجستی به مخالفان خویان . و اوانه‌ی که چون بو استقبال حضرت حکمدار به شرف زیارت و پابوسی نایل بون .

له داخل شاردا به امر جناب رئیس مجلس ملی شیخ عبدالقادر افندی بو استقبال حضرت حکمدار ترتیبات لازمه اجرا و یکیکی له بردرکای مال حضرت حکمدار ، یکیکی له بردرکای تلغرافخانه ، یکیکی له بر درکای مرکوت کوره ، یکیکی له برجادهٔ ویس له خارجی شاره وه چوار طاق ظفر دوست کرا و به گل و ریحانه و انواع شتی جوان تزیین کرا و بالای هویان به بیداخ شیرین کردستان رازانرابو روژی شمبه ۳۰ ایلول ۹۲۲ که خبری حرکت فرمونی حضرت حکمدار له‌دار یکی‌به ره کیشت له امبرو اوبری ام چوار طاق ظفره‌دا عسکر پیاده و شاگردان مکتب که ام شاگردانه یکی بیداخیکی کردستانیان به دستیه وه‌بو صف بستهٔ احترام بون و همو دوکان و بازار داخرا اهالی مملکت و عشایر و قبایل به سواری و پیاده‌یی تا دو ساعت و یکا کومل کومل به ریزهٔ له سرریدا وستابون .

ساعت شش و نیوی روژ حضرت حکمدار کیشته شار درحال طوپ آگر درا و له‌طرف عساکر و شاگردان مکتبه وه رسم سلام اجرا کرا و شاگرده‌کان مکتب کورانی ملی‌یان دخوینده‌وه له‌سربان مالانه‌وه ژنان و مندال همو کلاو و کلیان اخسته خواره‌وه کاباران‌ـ حضرت حکمداریان ده‌کرد . له‌دوایی‌دا که تشریفی کیشته دولتخانه له‌پاش امه که ۱۰ دقیقه استراحتی فرمو بو تشریفی له‌درکای اوطهٔ مخصوص حکمداری‌یه‌وه هاته دری عموم سادات و علما و اشراف و اهالی و مأمورین و سائره که له‌او حوشه وامه‌ندا به ریزه دا بشتبون هلسانه سرپی حضرت حکمدار براریان وستا و به سلام اظهار التفاتی فرمو لو وقته‌دا جناب خطیب افندی بو دوام اقبال و موفقیت حضرت حکمدار خطبه‌یکی خوینده‌وه .

حضرت حکمدار دایر به امه که بو ترقی کرد و کردستان به‌همو نوعی سعی افرمویت وبو خدمت ملت به‌جان ودل حاضره نطقیکی پرمعانی وشیرین فرمو . لپاش امه تشریفی چووه اوطه‌ی مخصوص حکمداری و له‌طرف بلدیه‌وه به‌عموم حاضرون شربت «قهوه» جگره تقدیم کرا .

له‌دووای ۱۵ دقیقه له‌پیشا سادات و مشایخ ، له‌دواییدا اشراف و متحیزان مملکت ، له‌پاشانا تجار ان و دایره به‌دایره مامورین بو زیارت قبول فرموران و له طرف تشریفاتچی مخصوصه‌وه تقدیم کران . ام زیارته هتا ساعت ۹ روژ دوامی کرد .

و نزدیکی هزار سواری عشایر که له خدمت حضرت حکمدار دا له صلاحیه‌وه هاتبون به ترتیب دسته دسته بو او جیکایانه که له‌پیشه‌وه به‌امر جناب جلالتماب شیخ قادر افندی بویان احضار و معلوم کرابو نیرران و اسباب استراحتیان تأمین کرا .

اوذاتانه‌ی که له صلاحیه وه له‌گرمیان کردستانه‌وه له خدمت حضرت حکمداردا تشریفیان هاتووه بو سلیمانی امانه‌ن :

رئیس عشیرت جباری سید محمد

» » داوده رفعت بك وعزیز آغای عباس آغا وعلی آغا

رئیس عشیرت زنگنه علی آغای حسن آغا وغفور آغای جامی آغا و حمه آغای کریم آغا

رئیس عشیرت بیات سلیمان بك و فارس بك و محمدحسون بك

رئیس عشیرت هموند امین آغای رشید آغا و عزیز

خسرو آغا يونس آغاى محمود خضر و برايشى جوهر آغا
شيخان قره حسن شيخ قادر شيخ رضا و سيد على
وشيخ امين وشيخ نجيب و سيد خليل آغا

له رؤساى عشيرت پشدر جناب عباس آغاى سليم
اغا وحسن اغاى مدير قاميش ومحمد اغاى على اغا ذاتا
له مه وپيش هاتبونه سليمانى انتظار تشريف هينانى
حضرت حكمداريان ده كرد .

وروژى له پاش تشريف هينانه وهٔ حضرت حكمدار
شيخ محمد وشيخ صالح مخدومان مرحوم شيخ سعيد
افندى كو پتيه تشريفيان هات بو سليمانى و نايل زيارت
حضرت حكمدار بون .

جناب حكمدار له بغداددا له كل حضرت ملك
عراق و جناب مندوب سامى له حين ملاقتيا زور
احترام كراوه بعضى ضابطان كرد بنا به خواهشى
خويان و مساعدهٔ جناب حكمدار بو امه كه له كردستاندا
خذمت بكن له بغدادوه له خذمتيا بو صلاحيه هاتبون .

حاكم سياسى پيشوى اليجه و جاف جناب ميجر
نويل كه اكثر عشاير كردستان دەيناسى و خويشى به
خير خواه كردان ناسراوه به صفت نمايندەئى يعنى
واسطهٔ مخابره له بين حكومت كردستان و حكومت
انكليسا بى . بنا به طلب جناب حكمدار رفاقتى كردوه
ام ذاته له كل حكومت كردستاندا هيچ مداخله يكى نيه .
و عادتا وكو قونسلوسيكى اجنبى به تا نتيجهٔ مذكره ديت
ليرايه مهمانمانه . به واسطهٔ ام مهمانه وه اميدده كه بين له
بين انكليز و عرب و كرددا توافقيكى چاك حاصل بى
حضرت حكمدار يكدو روژ كه له صلاحيه دابو له كل
رؤسا بعض مذاكرەى دفرمو و له اثر التفات بورؤساى
عشاير و اشراف كركوك و جيكايانى تر بعض لطفنامەى
تحرير و ارسال فرموه .

له بكزادان جاف جنابان كريم بك فتاح بك و
حميد بك و احمد مختار بك تشريفيان هاته صلاحيه
به شرف زيارت حضرت حكمدار مشرف بون و بوامهٔ
كه له كلارەوه له پاشا بين بو سليمانى رخصتيان طلب كرد
و عودتيان فرمو . له مدت اقامت حضرت حكمدار
و اتباعى له صلاحيه دا ابراز خلوص و مهمان نوازى
خاندان صلاحيه وكو جناب سيد محسن آغا و بابان زاده
جميل بك و سيد عمر اغا و سيد قادر آغا و حاجى
رشيد اغا حقيقتاً شايان تقدير وشكرانه . خدا ام نوعه
خانو ادانه دايما زياد بكا . حضرة حكمدار له كل اتباع
و رؤساى عشاير مستقبله كه له صلاحيه وه حركتى فرمو
اول شو له نار داوده له دەى عزيز آغاى عباس اغا شوى
دوم له قادركرم له مالى جناب رشاده ماب شيخ
عبدالكريم افندى دا شوى سيم له ... دا شوى
چوارم له داريكلى له دولتخانەى خويانا استراحتيان
فرمو . له ام ريكايانه باخصوص له داريكلى له بر مستقبلان
سليمانى و اطرافى ازدحام كرچه زور بو فقط اسباب
استراحت همو تامين كرا بو .

روژ شمبه ٣٠ ايلول ٣٣٨ صبحينى پاش هتاوكوتن
له داريكلى حركتى فرمو و نيوه رو سعات ٦ و نيو عسر
وكوله سره وه كردعرضحان بالبين والاجلال به استقبال و
احتراميكى فايقه وه داخل سليمانى بو له صلاحيه وه تا
سليمانى همو روژ چند طيارەيى دەهات له كل جناب
ميجر مخارەى تامين ده كرد . ايستا له سليمانيدا مجلس
عمومى تشكيل كراوه (رؤساى مذكورهٔ عشايريش دا ...
بو تثبيت و تامين بعض خصوصات استقلال مذكره
دكرى له نتايج مذاكرات و مقررات مجلس به واسطهٔ
جناب ميجر نويل بو بغداد بو مندوب سامى بنوسرى
و جوابى ور بكرى . جناب ميجر له مقابل دائرهٔ پوليس
خانو يكدا كه وقت انكليسەكان ( مفتش درك ) تيابو
دانيشتووه و اسباب استراحت و محافظەى له همو

خصوصیکەوە بە امر عالی اشـرف حکمدار ترتیت و تأمین کراوە . داخلی مملکتیش ایستا لەالحمد آسودەکی یە .



حریق لە ازمیر

لوندرە ١٤ ایلول لە ازمیردا محلەی روم وارمنی‌کان سوتاوە او آگرە سرایتی کردوتە محلەکانتر . لەبرامە ایتالیا کە تلاش اهالی چاو پی کوتووە تبعەکان خوی بە وابور رستگارکردوە و بوحمایەکردنی ایطالیای‌کان بوگردبونەوەی وابور حربی لەبردمی ازمیردا امری داوە .

استحضارات بریتانیا لە استامبولدا

مالطە ١٥ منە لەگل افرادوضابطان خاصەی هوایی بریتانیا بو حرکت کردنی پنج طیارە بو استامبول امر دراوە .

لە استامبولدا بریتانیا

مالطە ١٥ منە لە عسکرخاصەی امپراطور بریتانیا فرقەی دومی (سوسکس) سوار وابور [ صومالی ] بووە بو استامبول سوق کراوە . ام وابورە دوازدە هزار نفری تیدا بووە .

ام عسکرە لە مالطەدا ( مالطە جزیرەیکی انکلیزە لە بحرسفیدا ) لە قشلە و مسافرخانەکاندا دامزراون انتظاری اوردوی ( غردون ) و اوردووەکانتر دەکن .

ام فرقەی دومی ( سوسکس ) ە کە بکانە استامبول قوت بریتانیا لە استامبولدا بالغ ابیت بە ٦ فرقە پیادە و یك بطاریە طوپ صحرا و فرقەیك سواری کە فرقەیی ( هوسار ) ە .

چك آوسلوواقیا و رومانیا معاونت یونان دەکن

لوندرە — بنا بە تلغرافیك کە لە انقرەوە کیشتووە ( چك آوسلوواقیا احضارات عسکریە اکات لەگل رومانیادا بە یکەوە لە بالقاندا بو او محاربەیەی کە بە ام نزیکانە روادا و لە ضرر خالی نیە تصمیمیان کردوە معاونت یونان بکن .

روسیە و ترکستان

لوندرە ١٤ منە بنا لە تلغرافیك کە لە موسقوواوە کیشتووە بخارایی‌یەکان هج تجاوزاتیك کە لە طرف اوردوی سوویتەوە ( یعنی حکومت بولشویك ) واقع دبیت بو مدافعە کردنی وطنیان قراریان داوە بە شدت مقاومت بکن

اوترکانەکە لە المانیادان بانك کراونە ژیر سلاح

برلین ١٥ منە هموارباب اسنان ترك کە لمانیادان بواشتراك اوردوی ملی اناطولی امریان پی کراوە .

§

## میجرنویل

وکیل مندوب سامی عراق جناب میجر نویل کە لەبغدادەوە لە خذمت حضرت حکمدار کردستاندا هاتبو بو سایمانی شو جمعە ٦ تشرین اول ٩٢٠ لەگل چند ذاتی بە اوتوموبیل چو بو کرکوك بزانین کەی عودت دکا خدا خیرمان بو بکا .

## اسماعیل خان سمکو

مدەیکە لەطرف اسماعیل خاوە هیچ خبری نبو دوینی لەبانەوە خبری هاتوە کەسردار نصرت (سمکو) لەپاش امە کەجاری ( مقرمدیمی حویان ) لەعجمان بزور

گرتەوە . لشکر مظفر شکاکانی بو طرف سلماس روانه کردو دیلمان کەمرکز محال ( صفا ) سلماسه له دشمنان خوی پاك و استرداد کردوە . خدا کرد ان لەسر حق لەهمو جیکایەکا غالب بکاو به ماموران مغرور عجمان دوسمانیش انصاف و فهمیکی باسیاست بدا تاام خونه رژاندنه لەبین دو فرقەی اسلامدا تواو بی .

بکیشه خنجرت سمکو بده نعره هتا توران
سلامی کە لەشەرای کە یارە بو همو کردان
نهایت ده به قاجاران کەجای قاجار لەتورانه
ولی جای پهلوی وفرسان تواوی ملك ایرانه
دسا دیبو کریان هلـن لەکل منکور بە آزانه
بیستن رەی فرار (     ) اسیری کن بەمردانه

---

لشکر جناب (اوزدمیرپاشا)

او چتەیه یا مفرزەیه کەبه ناو حکومت ترکیاوه له رواندزەوەبنا به تکلیفی لەسر اختلافیکی مابین رؤسای عشیرت پشدر واقع بوبو له کل بنجا شصت سواریکی عشیرت پشدری تا سورطاش ( ناحیهٔ سلیمانی ) هاتبون و بنا برنفاق و اختلافات قدیمه و معلومهٔ له کل یکتری اهل سلیمانی بو دعوت او چتەیه زور کاغذ نیرابو کوتو پرله آو ( زه ) پریونه وه او برروبه رواندز . قوماندان او مفرزەیه یوزباشی فوزی افندی بو که ام جوانه چند سال لەبەو پیش لەمعیت مصطفی پاشا دا ( صاحب امتیار ) بووه کوریکی نازك و به تربیه بو هرچند ام دفعەیه ملاقات نه بو فقط وکو ترکەکان دلین اوغرلر اولسون .

∴

کویسنجاق

لەافواه خاص و عامدا وا دوران دکا که حکومت انکلیز کویسنجاغی به طیاوه بومباردمان کردوه زور به شدت و له نفوسیشدا تلفیات بووه لەسر امه اهالی مجبور بون او چند نفرەی ترك کەخویان دەوتیان کردبو جوابیان داوه . خدا همو کردستان محافظه بکا لەسایهٔ دوراندیش و مرحمت حضرت اشرف حکمدار لەام روژانه دا شورداش دکان و سائر ملحقات سلیمانیه لەاو نوعه بلایه محفوظ بون .

---

ای وطن چند خوشه ویستی روح شیرین منی
مزرعەی تخم نشاط و باعث ژین منی
بیتو ارمن کوهکن بم وصل شیرینم بی
تیشهٔ نادم له بردی توی که شیرین منی
کرچه ارضی هیند بلندی وختە لای من بحیثه عرش
و اسطەی مرتبتی اجرای آیین منی
افتخار مای توی مادریکی مهربان
خوا هلاتیشی بەتودا ماه و پروین منی
نو بهاران بەوهوای زور صافەوه وك جنتی
فصل زستانیش سراسر باغ نسرین منی
بوچی نقد جسم و جان خوم به شاباشت نکم
خاکراه حکمران عز و تمکین منی
آرزو فکر سیاحت ناکم ایتر ای وطن
تو له جیکای قاهره و طاران و برلین منی

زیور

---

اعلان

دوسیه ٣٣٨ — ١٧٦

او خانوه کەلەمحلهٔ کویژه واقعه و به اعتبار شش حصه یك حصەی عائد به حمه علی متوفیه به دو صد روپیه بو عهدهٔ مشتری احالهٔ اولیەی کشیده کرا . بناءً علیه بو احالهٔ قطعیەی تا پانزه روزی تر وضع مزایدهٔ علنیه کرا . بم مدته صدی پینج ضمائم قبول دکری هرچی طالبه صدی ده تأمینات مستصحباً مراجعت به دائرهٔ اجرا ومنادی توفیق آغا بکات .

سنه ٣ تشرین اول ٣٣٨    ماموراجرا
م . وهبی

---

لەچاپخانهٔ حکومت له سلیمانی چاپ کرا

صاحب امتياز و مدير مسئول
و سر محرر
مصطفى پاشا

محرر كردى و فارسى
على كمال و م . نورى

بو داخل شهر ولوا بدل آبونه
۳ مانك دو ٦ مانك چوار
ساليكى ۸ روپيه يه

# بانگ کردستان

اعلانات بدريك
۳ آنه ده سينتريت

بو خارج اجرت پوسطه
علاوه ده كرى

بو همو شتيك مراجعت
به صاحب امتياز اكرى

(زمان كورزو رم رابوردو ايستا پالوان علمه)
(سلاح دسته صنعت بارقهٔ تيغ ومثال علمه)

تاريخ انتشار
۲ آغستوس ۱۹۲۲

علمى ، اجتماعى ، ادبى ، فرته‌يكى حر و سربست ملى يه

نسخه‌يكى به ۲ آنه ده‌فروشرى	هفته جاريك دردچى	سليمانى

سال ۱	ژماره ۱۰	[ يكشمه ]	۲۳ صفر ۱۳٤۱	۱۵ تشرين اول ۱۹۲۲


## صورت ارادهٔ عليهٔ حضرت حكمدارى

عـدد — ۱

۱۸ صفر الخير ۱۳٤۱ — ۹ تشرين اول ۱۹۲۲

له مملكت سليمانى دا نوسرا له محمود ابن سعيد

بو كافهٔ ملت كورد

له پاش طلب سعادت و مغفرت له بارگاه احديت ، بو ام ملتـه مظلومهٔ خومه اعلان اكم ، كه له بر بعضى اسباب و عوارض سياسـيه مدتيك له خدمت ام ملته صادقهٔ كورده دور و مهجور مابوم . ايمرو له سايهٔ خدا و روحانيت مصطفى [ صلعم ] وهمت اجداد و له سايهٔ نياز و تضرع و قوت ام ملته صادقه‌وه گيشتمه ام روزه مقدسة كه موفقاً هاتومه‌وه و له ايمرووه دستم كردووه به تدوير پروانهٔ حكومت ومحافظهٔ موجوديت و استقلاليت كوردستان . اميد و آرزو اكم هموتان به يك غايه ومسلك و بى فاصله سى بو دوام ام روزه و كوشـش بو تعـالى ام ملته اكه‌ن . كورد ! وكو يك عائله متفقاً و متحـداً له گل مندا بو تحكيم ودوام ام حقه صريحه يه كه دستمان كوتووه لازم وفرضه سى و غيرت بكه‌ين . اى ملتم ! امين بن كه ضامن سعادت وموفقيت اقوام اتحاد و اتفاقه . وملتى كه خوينى رشتبى بو حق خوى قطعياً محروم و اسيرنابى وقرارعالم مدنيتش امه يه كه هرقومى وهرعنصرى خوى به خوى ابى اداره بكات . اولاً ايمه كه ملت كوردين ثانياً بوام غايه يه قربانيكى زورمان دا ، به اوشرطه كه يك دل ويك زبان و يك وجود بين به اذن خدا هيچ كس ظفرمان پى نابا ، ومنيش تا آخر قطره خون ومال خوم و اولاد واتباعم بوسعادت ايوه صرف كردبو و تكرار ايكم . همت له ايوه موفقيت له خدا .

حكمدار كوردستان
محمود

## صورت ارادهٔ عليهٔ حضرت حكمدارى

عدد — ۲

۱۹ صفرالخير ۱۳٤۱ ، ۱۰ تشرين اول ۹۲۲: .

له مملكت سليمانى دا نوسرا .

بو تشكيلات حكومت كوردستان نصب و تعيين

ام ذاتانەم لەقابینەی حکومتدا مناسب دبی .

| | |
|---|---|
| سپهسالار | شیخ قادر |
| رئیس داخلیه | شیخ محمد غریب |
| رئیس مالیه | عبدالکریم علکه |
| رئیس معارف | میرلوا مصطفی پاشا |
| رئیس شرع و عدل | ———— |
| رئیس کمرك | احمد بك فتاح بك |
| رئیس نافعه | محمدآغای عبدالرحمن آغا |
| رئیس امنیت عمومیه | سید احمد برزنجی |

مفتش عموم حکومت کردستان میرلوا صدیق القادری پاشا

هر کسهٔ مقام و وظیفهٔ خویم پی سپاردن و اراده اکەم درحال دست بە تدویر ماکنهٔ حکومت بکەن .
و من الله التوفیق .

حکمدار کوردستان
محمود



شوکتمآب حکمدار کردستانە جناب شیخ محمود دام اجلاله چند روژی کە اندکی نامزاج بو بحمدالله بە تواوی اعادهٔ عافیتی کرد . روژی ۸ تشرین اول درهمو بر رؤسای عشایر و زوار سائره کە لە خزمتیا بونە التفات مخصوصهٔ بذل دفرمو . کە اندکی نامزاج بو دیساە ام روژانەیسه هرلەکل اصلاح و تدویر امور عباد مشغول بونه خوا لەهموخصوصیکەوە موفقی بالخیری بکا .

( انکلیس چامانی بو چی دوی )

معلوم جهانە انکلیس دولتیکی مترقی و بە قوتە کرچی نفوس موجودەی خوی انکلیس بە قدر ۳۵ ملیون دەبی فقط لەآسیا ، لە آفریقا ، لە اوستراليا و لە جیکایان تر اوندە مستملکاتی واسعە ، اوندە تبعهٔ زورە نفوس انکلیس لە ۳۰۰ ملیون تجاوز دکات یعنی لە دنیادا دولتی کە لە نفوسدا وکو چین کە یکینه انکلیسیش لە نفوسدا نزیك بە چینە . قوتی بحری لە جهاندا یکتایە و لەپایتخت خویەوە هر سفینەیکی حربی ویا تجاری کە بو امریقا حرکت بکا لە همو عزیمت و عودتیا او سفینەیە هر لە ملکی انکلیزدا روژی لی آوا دەبی . قوهٔ بری کرچی لە پیش ام حرب عمومی رابوردووا لەدرجهٔ ششم و حتی هفتمدا بو فقط لەاثنای حرب عمومیدا بە سبب تشکیلات تازەوە قوهٔ بریشی عادتا لە جهاندا کیشتە درجهٔ دوم و بلکو یکم .

لەسایهٔ تجارتیکی عظیم و مشهوریەوە ثروتی لە کل امریقا تقابل اکا و بلکو لەو زیاترە .

هر چند معادن آلتون جهان هیه غیر از چند پارچەیکی نی هموی لە تواریخ مختلفەدا هریکی بەنوعیك کرتویەتی یە زیر دستی خوی .

پایتخت امدولتەکە وکو لوندرەبی نفوس موجودەی تقریبا نزدیك بەنفوسی ممالك ایرانە .

ام دولتە بەسبب ملك اصلی اوروپای خوی کە وکو جزایر بریتانیا بی قرالیت بو یعنی حکمدار اریکی زوورنامدار نبو . فقط بەسبب مستملکاتیەوە باخصوص لەسایهٔ استیلای هندستانەوە کە لە همو خصوصەوە لە جهاندا بە اولین قطعه حساب دکری امپراطوری یعنی شهنشاهی بو حاصل بووه . ایستا ام امپراطوری یە بومحافظهٔ احوال وعظمت خوی هرسیاستی کەلازم بی هر تشبثی کە مناسب بی مجبورە بیکا . چونکە تأمین محافظهٔ هندستان بو امە کە نکویتە زیر احتمال تهلکە انکلیز بەکثر همو شتیکا دەچی همو فداکاریی دکا . حتی پیی ممکن بی هر چند دربند کوەقاف ( کە یعنی ققفاسیا ) و دربندان شمال و شرق افغانستان وکو

هرات و سائره بی هموی بەعسکر انکلیس اشغال دکا .
ام جیکایانه بو احتیاج پاره و انتفاع سائره نابی ام احتمالات و تصوراته هر بو محافظهٔ عروس هندستان یعنی بو بقای امپراطوری انکلیسانه .

سلیمانیەیش که له کردستان جنوبیدا نقطەیکی مهم سوق الجیشی یه له نظر اوروبائی و آسیائیدا اهمیتی انکار ناکری .

تا امتیاز شمندوفر اسکندرون و بغداد که لەمدەیکی مدیدەوه انکلیسیان طالبی بون به اجانب ترندرابو و بو محافظهٔ ریکای هندستان ، مصر و قنال سویش لازم بیزرابو انکلیسان هر نظر دقتیان بو اوایه متوجه بو . ۳۸ سال لەمەو پیش بهر انواعی بو مسئلهٔ عرابی پاشا و سائره احداث کرا او وقته انکلیس لیسی هاویشته مصر و سویش له اوریکایه امین بو و تجارتیشی خیلی ترقی کرد .

وقتا که : لەپاش او انقلاب مشئومەی حکومت عثمانی کەاختیار لەمقام خلافت و سلطنتدا نەدیشت و نفوذ و قوت کوته دست قسم اسافل و جهلاوه او وقته بی دون محاکه و تأملیکی دریژ امتیاز اوخط شمندوفره به دولت المانیا درا کەام دولته براً لەانکلیس به قوت‌تر و لەتجارتیشدا رقیب انکلیس بو لەفنون و صنایعدایش راستی منورانی لەانکلیسەکان زیاتر بو و فکر المانیش ذاتاً لەکل متفقانی استیلای قسمیکی زوری آسیای صغرا وحتی به تدریجی همو عراق و هندستان بو و جهانیش دیزانی که المانیا لەاعمال طوپ و تفنك و جبخانه و همو وسائط حربیەوه دست بالاترین دنیابو و لەکل امیش اهالی آسیای صغرا یعنی اناطول . سەرو به عراق و باخصوص همو کردستان و همو ایران قسماً لەبر بی مشغولیتی و قسماً لەبر تعصب دینی و عرقی به اندك تحریکات و تشویقاتی باخصوص کەام خصوصه به ناوی اسلامیتەوەبی و له طرف دولتیکی وك المانیاوه به سلاح و جبخانه ( کەام وسائط و اسبابانه لەلای ام جیکایانه لەهمو شتی خوشه ویست‌تره ) تجهیز بکری ایتر ام اقوام متعصب و شجیعانه بو حرب وضرب له کل هر دولتیکی اوروپائی باخصوص له کل انکلیس که به سبب پروپاغاندهٔ چند سال لەمەو پیش المان و ژون ترکان بەدشمنی خلافت و اسلامیت نشان دراو وتشهیر کراو بو دەبو بەباعث هرج و مرجیکی عظیم و بو تهلکەیکی له همو تهلکان بزرکترین و امانیش لەنظر انکلیسدا البته معلوم بوبو . چه حاجت ام خصوصانه کەوتمان همو لەحرب عمومیدا معلوم و مصدق بو و انکلیسی زور مشغول وحتی لەهندستاندا کلی اغتشاشات و ایقاظاتی تولید کرد که امانه همو بواخافهٔ شرف امپراطوری انکلیس ( کەوکو وتمان لەسایهٔ هندستانەوەیه ) اسباب و تهیات کوره بو .

انکلیس چه له پیش حرب عمومیدا ، چه لەهنکام حربدا که ام پروپاغاندا و تهالکەی چاو پی‌کەوت نکری کوته سر ضبط و استیلای عراق که آنیاً چه له اوروپا و آسیای صغراوه و چه له شمالەوه لەطرف روسیەوه بو جهت بحر بصره یعنی بندریکی عظیمی سر ریکای هندستان هر حرکاتی که بی بتوانی ری ندا و لەبین لوندره و کلکتەدا له استنادکاه و نقطهٔ متوسط مهم بصرەدا بتوانی تشبثاتیکی لازم بکا .

ایستا که امه معلوم بو و دزانین تهدید و محافظهٔ عراق به کردستان جنوبی به وەیه چونکه کردستان له شاخ آکری (آغری یاخود آرارات که له شمال بایزید له بین حدود قدیمهٔ روس ، عثمانی و ایراندایه ) هتا خانقین یعنی نزیك به جبال‌لرستان همو ام شاخ وداخه که همو به قوم‌کردەوه مسکونه له مواسم اربعەدا هر منطقهٔ سلیمانی‌یه که بو عبور صنوف ثلاثه مساعد بی

استیلای یاخود بەهەر نوعیکی تربی لە ژیرتأثیری نفوذی ئانکلیسدا بونی بو اوقومە لازم بیترا و اغلب احتمال بو امە هاتبونە سلیمانی .

کرچی کردستان جنوبی اوی لە دنیادا ئیستا بە قیمتە وکو معادن نفت . خلوز . وسائرە زوری هیە فقط البتە وکو هندستان . اوسترالیا . ترانسوال ( لەافریقای جنوبیدایە ) . عراق وسائرە بوانکلیس فوائد و منفعت مادی و معنوی نابی فقط لە بر مطالعات پیشو بو تثبیت و تحکیم نفوذیان لە عراقدا سلیمانی زور مهمە .

ماویتی

## مصطفی پاشا

∴

جناب میجر نویل

وکیل مندوب سامی دولت فخیمۀ بریتانیا جناب میجر نویل کە لە کرکوکەوە بە طیارە تشریفی بو ئیرە هاتبو لەمدتی غیبوبتیدا جناب کپتن چیمن ( حاکم سابقی چمچمال ) وکالتی دە کرد . روزی ٩ تشرین اول ٩٢٢ بەطیارە عودتی فرمووە بو سلیمانی و وکیلەکی بەطیارە رویشتەوە بو کرکوك .

---

سمکو ( سردار نصرت اسماعیل خان )

لە مینا آغا کە رئیس عشیرت گەورك طرف ساقزە و خوی ایستاکە لە دەی کندە سورە ( تابع بانە ) یە روایت دکن جناب سمکو ( اسماعیل خان سردار نصرت از سرنو شهر رومیەی استیلا و استرداد کردوە و عشایر کردان او طرفانە حتی گلباغی و سائرەی جهت ساقز وجوار سینەیش بو معاونت سمکو بالعموم حاضرن و حکومت ایرانیش ام جارە لەهمت و ثبات کردان تی کیشتووە و بو مذاکرە و ریککوتن خبری بوسمکو ناردوە . معلوم دبی کەخبر خیر تشکل حکومت مستقلەی کردستان لەسلیمانیدا دمار حمیت و غیرت کردانی هیناوەتە حرکت .

دسا کردان بە قربانتان هو یك بن وکو شیران
رهابن تا خدا بیکا لە ظلم دائمی ایران

---

دیسان بومبا ـ

لەو روزانەدا کە بەطیارە کوی سنجق بومباردومان کرابو دیسان طیارە لەناحیۀ شیخ بزنی چند دیهاتیکی تری بەبومبا بومباردومان کردوە و اهالی شیخ بزنی بوشکایت بوسلیمانی تا دی باغ هاتبون حضرت حکمدار چونکە لە ماسبق و اسباب ام وقعەیە مستحضر نبو بو و ام ایشە لە کرکوکەوە بووە بە شیخ بزنییەکان امر جوابی لازم اصدار فرمووە او انیش کراونەوە .

---

« تعین »

مشهور رسول ناجی افندی کەلەالبجە مأمور دەبك بو لەسر اعلان حکومت کردستان کەگراوەتەوە سلیمانی اجارە بووە بە کاتب لەمعیت جناب وکیل مندوب السامی شایان تبریکە .

∴

حضرات محترمۀ بکزادان جاف

جناب علی بك محمود پاشا . جناب کریم بك فتاح بك . جناب حسین بك محمود پاشا . جناب حامد بك مجید بك . جناب احمد مختار بك عثمان پاشا . جناب احمد بك محمود پاشا . جناب حسین بك حسن بك . جناب احمد بك محمد صالح بك . جناب داود بك محمد سعید بك . جناب محمد بك فتاح بك . جناب شهاب السلطنە عثمان بك عبدالله بك شرفبیانی روز دوشمو ٩ تشرین اول ٩٢٢ تشریفیان هاتووە بو سلیمانی بو زیارت حضرت حکمدار کردستان . ولە معیتانا کتخدایان جاف لە شاطری کتخدا محمد ابراهیم و احمد محمود و حمە طالب سلیمان علی ویس ولە روغزادی کتخدا صالح کاکە خان و

رستم حمهٔ محمود و حمه رشيد باباجان و فتاح كامران خسرو
و حمه علی محمود له ترخلق حمه حسن و حمه شاسوار و
رويتن سليم احمد له هارونی علی محمد امين و عبدالكريم
حاجی و عبدالحميد محمدامين له صدانی خسرو مصطفی
و كتخدا احمد البچه له نورلی علی عزيز له بيكاثيل
رستم حسن حاجی قادر و عزيز حمه كدرون و ميرزای
حاجی حسين و حسين احمد شاسوار و حمهٔ فتاح سمايل
و حاجی كاكه ويس هاتون بو سليمانی .

## صورت ارادهٔ عليهٔ حضرت حكمدار كردستانه

عدد — ۱

**۱۸ صفر الخير ۱۳٤۱ — ۹ تشرين اول ۱۹۲۲**

كردستانك پايتختی سليمانيه ده تحرير ايدلمشدر
محمود ابن سعيد دن كرد ملتنك كافه سنه

باركاه احديتدن طلب موفقيت وسعادت ايله دكدنصكره شو مظلوم ملتمزه اعلان ايدرزكه بعض اسباب وعوارض سياسيه دندولايی برمدتدركه صادق كرد ملتنك خدمتندن دور و مهجور قالمشدم . بوكون الله و روحانيت مصطفی [ صلعم ] و همت اجداد ايله شو صادق ملتك نيازتضرع وقوتی سايه سنده موفقاً بويوم مقدسه يتشدم وكافی السابق كردستانمزك حقوق و استقلاليتی بولنده تدوير روانهٔ حكومته باشلادم . اميد و آرزو ايدرزكه هپكز بك غايه وبك مسلك وبلافاصله بومقدس كونك دوامی ايچون سعی و بوقومك سائر اقوام مثلو تعالی وترئيسی اوغرنده كوشش ايدرسكز . كردلر ! استحصال ايتديكمز بوحق صريحك حمايه وصيانتی ايچون يككوجود بر عائله كبی متفقاً و متحداً البرلكيله چاليشمقلغمز الزم و فرض عيندر . ای ملتم ! امين اولكزكه سعادت و موفقيت اقوام اتحاد و اتفاق اساسانه مبنيدر . و حقوق مشروعه سنك استحصالی يولنده قان دوكمن برملتك محروم اولهرق اسارته دوشمسی غيرقابلدر عالم مدنيتك « هرملت كندی كنديسنی اداره ايدر » قراراتنه باقيلهجق اولورسه اولا مادامكه بز جهانده موجوديت مليه يه مالك اولان ملتلر صره سنده يز وثانياده استحصال حقوق اوغرنده لايعد و لايحصی قربانلر ويرمشز ، يك دل يك زبان و يك وجود اولمق شرطيله باذن الله تعالی هيچ كيمسه حقمزی غصب و غدر ايده مز . باشده بن و صوكره بالجمله اولاد و اتباعم قانمزك صوك داملهسنه و مالمزك صوك آقچه سنه وارنجه يه قدر بو ملتك تعاليسی ايچون سابقاً نصل صرف ايتدكسه اويله جه ده فی مابعد صرف و بذلنه هر دائم آماده يز . سزدن همت و اللهدن موفقيت ديلهرم .

حكمدار كردستان
محمود

## صورت ارادهٔ عليهٔ حضرت حكمدار كردستانه

عدد — ۲

۱۹ صفر الخير ۱۳٤۱ ، ۱۰ تشرين اول ۱۹۲۲ .
كردستانك پايتختی سليمانيه ده تحرير ايدلمشدر .
كردستان حكومتنك تشكيلی ايچون آتيده كی ذواتك حكومت نابينه سنه تعيينلرينی مناسب كوردم .

| | |
|---|---|
| باش قوماندان | حفيد شيخ قادر |
| رئيس داخليه | شيخ محمد غريب |
| رئيس ماليه | عبدالكريم علكه |
| رئيس معارف | ميرلوا مصطفی پاشا |
| رئيس شرع و عدل | ——— |
| رئيس كمرك | احمد بك فتاح بك |
| رئيس نافعه | محمدآغای عبدالرحمن آغا |
| رئيس امنيت عموميه | سيد احمد برزنجی |

كردستان حكومتی مفتش عموميسی ميرلوا صديق القادری پاشا
هر كسه مقام و وظيفه سنی تعيين ايتدم و دو حال

ادارهٔ حکومته باشلانلماسنی اراده ایدرم و من الله التوفیق .

حکمدار کوردستان
محمود

## حقیقت کردستان

مابعد

کیت کیده اثور یلرله بابللرك باتختلرینی دخی ضبط ایدەرك امیاده بیکارجه منه لر استقلالیتلرینی محافظه ایتمشلر و بالاخره بو حکومتلر نقسا .ه اوغرامش ایسه دە ادارهٔ حکومتینه اکثریا یرلی قومدن معدود اولان پهلوی و یاعینی جنسدن اولان فرس و کرد اکابر و اشراف یدندهقالمش و کردستانك دوچار اولدیغی بیکارجه انقلابات و تعدیاتده صبر و متانتلریله برابر کردلر لسان و قومیتلرینی محافظه ایدە بیلمشلردر .

### کرد و کردستان نه دیمکدر

کرد کلمه سی اساساً کاف عربی ایله تلفظی صحیح دکل ایسه ده لسان عربی ده کاف فارسی بولنمادیغندن ظهور اسلامدن صوکره کاف عربی ایله قولانلمش و بناءً علیه غلط مشهور اوله رق قبول ایدیله کلمشدر . شمدیکی کرد قومی ماد حکومتننك انقاضندن اوله رق وقتیله مازندرانیلر و افغانیلرله ایران قدیمی تشکیل ایدن پهلوی عنصر اصلیسنك احفادیدر . تواریخ قدیمهٔ فرسیه ده و روایات متسلسلهٔ ملیه ده الیوم کردلرك مسکون اولدقلری محللر اهالیسی قدیمده عمومیتله پهلوی نامی تحتنده طانلمشلر و بالاخره بو قومك بر قسم اعظمنك و آتیده کی بعض ایظاحاته نظراً عارضه لی و طاغلق یرلرده مسکون اولان قبائل وشعباتنك الك زیاده تورانیٔ قدیملر ایله وقوعه کلمش اولان محاربه لرنده ابراز شجاعت و استحصال موفقیت ایدن بر رئیس قومه وبریلن و پهلو — قبورغه — کلمه سندن مأخوذ پهلوان معناسنه قریب اولوب حقیقت حالده اصل پهلوی کلمه سیله معنا مترادف بولنان ( کرد ) یعنی قهرمان نامنه اضافتله شهرتیاب اولمشلردر . مابعدی وار

---

## اعلان

زماره ١٤

له اعتبار ١٤ تشرین اول ١٣٣٨ وه عموم دوائر حکومت بیانیان لهساعت ٣ وه هتا شش باش نیوه روان له ساعت هشتەوه هتا ساعت یازه دهبی دوام بکن خلاف امر ماموریك معامله بکات تجزیه ده کریت .

١٢ تشرین اول ٣٣٨ نائب حکومت

---

نومروی دوسیه ٣٩٠

او خانوهی که له محلهٔ گویژه واقعه و له بین ملا امین کوری ملا قادر خاق محلهٔ دوگزن و شیخ علی کوری شیخ محمد سرکار وخورشیده کچی مصطفی خاق محلهٔ کانیسکان مشترکه و لدی الکشف چونکه غیر قابل تقسیم بونی تحقق کردوه لهسر متخذ قرار بهصورت بیع بو ازالهٔ شیوع و پاش تنزیل مصارف اثمان حاصلهی له بین شرکا تقسیم بکری لهتأریخ نشر ام اعلانه بو احالهٔ اولیه به مدهٔ چل و پینج روژ وضع مزایده کراوه هچ کسی بو شرای طالبه دهبیت پیشیناً صدی ده بی و تأمینات بدات و مراجعت بهمحکمهٔ بدایت سلیمانی قسم صلح و منادی توفیق آغا بکات .

٧ تشرین اول ٣٣٨ حاکم منفرد محکمهٔ بدایت سلیمانی
صدیق مظهر

---

نومروی دوسیه ٧٦

له طرف وکیل حلاوه کچی حاجی عبد الله لهسر اقامهٔ دعوای شفعهی اوخانوه که لهمحلهٔ گویژه واقعه لهعلیهی محمد وکریم و فاطمه اولاد خضرافندی ، له نتیجهٔ تحقیقاتدا چونکه تحقق کرد لهمدعی علیهم محمد محل اقامتی مجهوله لهبر امه قرار درا بطریق الاعلان تبلیغاتی پی ایفا بکری . اگر سا ٩ تشرین ثانی ٣٣٨ روژی پنجشمه ساعت له چوار یا بالذات خوی یا وکیلکی قانونی لهمحکمه حاضر نبو غیاباً محاکمهی رؤیت ده کری .

سا ٩ تشرین اول ٣٣٨
حاکم منفرد محکمهٔ بدایت سلیمانی
صدیق مظهر

له مطبعهٔ حکومت له سلیمانی چاپ کرا

صاحب امتیاز و مدیر مسئول
و سر محرر
مصطفی پاشا

اعلانات سطریك
۳ آنه ده سینرت

بو همو شتیك مراجعت
به صاحب امتیاز اکری

# بانگ کردستان

(زمان کورزو وم رابوردو ایستا پالوان علمه)
(سلاح دسته صنعت بارقهٔ تیغ وسنان علمه)

علمی ، اجتماعی ، ادبی ، فنی هیکی حر و سربست ملی یه
هفتهٔ جاریك دردچی

نسخه‌یکی به ۲ آنه ده‌فروشری

محرر کردی و فارسی
علی کمال و م . نوری

داخل شهر ولوا بدل آبونه
۳ مانك دو ٦ مانك چوار
سالیکی ۸ روپیه یه

بوخارج اجرت پوسطه
علاوه ده‌کری

تاریخ انتشار
۲ آغستوس ۱۹۲۲
سلیمانی

سال ۱ ژماره ۱۱ [ جمعه ] ۲۸ صفر ۱۳٤۱ ۲۰ تشرین اول ۱۹۲۲

## عبرت

تا ایستا هرچی وقایعی به سر کردان دا هاتی که موجب کلال وملال بوبی اکثر له‌بر نفاق وشقاق بین خویان بووه . ام نفاق وشقاقه که له‌کردستانا موجوده له مده‌یکی مدیده‌وه مرکز جریان وفورانی ام سلیمانی‌یه‌یه که ام شاره به آشوبه خدا اصلاح و اعماری بکا له تاریخ ۱۱۹۹ دا له وقت حاکمان بابه‌دا اعمار کراوه که له پیشدا له قلاچوالانا اداره‌یکی مخصوص کردی یان بووه .

له او روژه وه که سلیمانی بنا کراوه تا ام روژانه له‌بر اختلافات بین عشایر و اهالی و له‌بر نی نگیشتنی فواید اتفاق و یکجهتی سلیمانی وکو ایستا که دی‌بینین نه وك مملکتان‌تر معموریتیکی پیدا کردوه ، نه اهالی و عشایر راحتی‌یکی تامه‌یان بوحاصل بووه .

حتی داژ به‌نفاق و اختلافات جنتمکان مرحوم شیخ (معروف) نودهی له‌وقت خویا به عربی العباره

نامه‌یکی مهم پر معانی بو یکی له سلاطین عثمانی ناردوه انشاالله له‌خدا تمنی اکین له‌سایهٔ حسن نیت وخیرخواهی حضرت حکمدار کردستان اجرآت و اصلاحاتیکی مستعجله و محقه دکری تا ریشه و بناغهٔ ام نفاق و شقاقه برطرف بکری تا قسم چاکان راحت و رفاهی بوبی . و روح مبارك اوشیخ اکبره‌یش شاد ومستریح بی وافتخار بهام حفیدز ادهٔ مکرم خوی بکا . صرف نظر له‌وقایع سابقه مثلا : له زمان حکمرانی عجماندا کسی که حظی له کسی نکردبی بو تحریك و افسادات تاسنه وطهران چون نهایت اشکری عجمیان هیناوه‌ته سلیمانی واطرافی چند دفعه تالان کراوه ، نفوس زور کوژراوه ، حتی زوز له‌ژنانیش به اسیری براوه .

له‌زمان عثمانیشدا بعض مغرضان بو اضرار و اذیای رقیبان خویان تا مرکز ولایت بغداد چون اشکر ترکیان هیناوه بون به باعث قتال وفساد عظیم ! چه ایران چه ترکانیش له‌وقت خویاندا له جیکای اعمار مملکت

وتنویر افکار ملت اکثریا بەبی محاکه لەوجوه و معتبران کردانیان یا کشتوه ، یا بو دیار بعید بە نفی و تغریب افنا کردوه . چه حاجت لەشاخ ( آکری ) یعنی اراراتەوه تا جنوب لرستان چه لەعجمدا . چه لەرومیدا نە مدارس و مکاتبیکی منتظم بنا و نە شوسەیکی بە قدر کیلو مترەیك دریژ درســت کرا نە چند اولادیکی کردان بو تحصیل علوم و معارف بو ممالك متمدنه نیررا .

او بی‌همتی‌یه کوا ایه ایستا لەآثاری متأثر ومحزونین چونکه صرفنظر لە عربانه و اوتوموبیل هیچ ریکایکمان نەبوه کە بە راحتی بار و کاروانمان پیدا بروا ؛ ایستایش بو تداوی نخوشانمان بو بفریاد کیشتن مجروحان و اطفالمان طبیبی نیه .

لە حرب عمومیدا او مظلمە لە صلاحیه . لە سلیمانی و اطرافیا درحق بە اهالی و فقرا کە کرا همو هر نفاق ام منطقەیه بو .

بو معاونت بەترکان لەوانەی کەچو بون ۱۷ پیاو معتبر و محترم جاف کە بە امر ترکیك عادی بە مترالیوز کوژران و لەسلیمانی‌دا چند جوانان بەبی محاکه نشـانهٔ کلەکران لەپاش ابراز مهمان نوازی و خاندانی خـوی محمد خان حاکم بانه و سیف الدین خان حاکم سـقز و حسین خان حاکم سـابلاغ و شیخ بابای مشهور طرف مکری کە بە بی سـبب و صـلاحیت تالان کران و کوژران دیسان اثری نفاق داخلی بو . چه حاجت ! لەوقت حاکمان بەبەدا کە اطرافی کلعنبر وحق جوار سلیمانی دائما لەژیر تهدید ایرانیان ( حکومت اردلان ) دا کە بو وحاکمان بەبە کەلەاو وقتانەدا معاونتیشیان لەعثمانی دینی بەتواوی عاجز و مأیوس مابونەوه و نهایت بە توسط مشایخ و صلحای ام جهتانه مراجعت بە ام عشـایر جافه کرا کە او وقته لە اوبر سیروان لەجهت جوانرو اداره و صلاحیتیکی مخصوصهٔ خویان بو لە بر رابطهٔ مذهبی یعنی شافعیت التماس و مراجعت حاکمان بەبەیان و امانیش همو تکالیف و مطالب او انیان قبول کرد صرف بو محافظهٔ کلعنبر کە منطقەیکی اهم سلیمانی‌یه ترك حکومت اردلانیان و وطن قدیم خویان کرد و او وقته رئیس بنام ام عشیرته کە ( ظاهر بك ) مرحوم بو کە باپیره‌کورهٔ عموم ام بگزادهٔ محترمان جافه‌یه لکل عشیرت وجماعت خوی پرینه‌وه جنوب شرقی کلعنبر یعنی طرف ( هزیایش ) لەاووقتەوه سلیمانی لەاوجهتانەوه لە تعرضات و تهاجمات ایرانیان امین بون و عشیرت جافیش ایتر لە نظردا محترم ومهم بینرا . لە سر امه ام خاك خومانه کە مع التأسف نازانم لەبرچی‌یه شرا نفاق دیسان بروز هینا و لە بعض طرفه‌وه کە اشتهار رؤسای جافیان لەلا گران هات و دستیان کرد بە فساد حتی بعضیکیان یعنی لە اوانیش کە لە وقت خویا لەبراو امبابه کە عرضمان کرد هاتنی جافیان بە شدت آرزو دەکرد . تا ســنه چون ؛ تا بغداد خبریان نارد لە علیه رؤسای جاف تشـویقاتیان دوامی کرد بە نزعی کە حاکم اردلان امان‌الله خان کوره بە بهانهٔ زیارت کربلاوه تا طرف پی‌باز هاتبو و لە دوستی‌یه‌وه زیارت مرحوم ظاهربکی طلب کردبو اویش لە صفوت قلب خوی چو بو زیارتی . لەاثنای زیارت‌دا بە طرزی کەلە قدیمه‌وه ایرانیان درحق بە رؤسای کرد کردویانه و دیکن بە خیانت ظاهربکیان کشت . حتی مشـهور رئیس هموند ( جوامیر ) یش کە لەسر وقایع معلومه التجای بە ایران کردبو و لەاطراف قصر شیرین‌دا دارا و دبدبەیکی پیـدا کردبو بە کشـتن چونی و بە دوچار بونی فضایح مأسـفهٔ لە طرف ایرانیانه‌وه دیسان هر لەسر نفاق کردان بو .

لە او روژانه دا کە لە سایهٔ توفیقات صمدانیه‌وه بە بی خوین رژاندن سرافرازی واستقلالیتی بو کردان

حاصل بووه ده‌بو هموابنای کرد خاصةً اهالی سلیمانی و اطرافی شوو روژ حمدو ثنایان بوخدا بکردایه و بو موفقیت حکومت ملی سعی به‌دل وله‌کل یکتری برادری و آشتی‌بونیان حاصل بکردایه تکبی ....!....!....!!

خدایا اوانه‌ی له‌ باتی سعی بو تحکیم حکومت ملی بوظهور اغتشاش ، بوتشویق فرقه له‌کل فرقه بشفاهی خبر و یا به کاغذ نوسین تشـویقات دکن ولئ له‌دنیاده طریق بونه‌وه له‌آخرتیشدا جزایان بده‌ی .

ام علتـه ، ام مرض ناهمواره و ام دزانی له کردستاندا هر موضع یه مکر له‌کویسنجاقیشدا ، له بعضی جیکای تریشدا هیه .

او روژه که خبر استقلال کردستان کیشتوته کویسنجق بعض له آغایان اوی چونه سـر تلغراف و وتو یانه ایمه استقلال و سـلیمانی‌مان ناوی . فقط لپاش امه که‌طیاره بومباردمانی کردون او وقته عقلیان هاتوته سرخویان وزانیویانه او تشـویقات و تحریکاته که بی اغفال بون بو خویان سم قاتله درحال دسیان کردوه به توبه و استغفار و به ندامت و مجبور بون درکردن اوچته روتله‌یه که‌نرراوه‌ته ناویان وتبعیت حکومت کردستان بکن تامرجعی واستنادکاهیکیان بوحاصل بی . بزانن‌که تشویقات ونفاق چند کسیك بو به‌باعث بومباردمان و اتلاف‌خیلی بیکناهان فسبحان‌الله ! ام کردان خومانه کی به‌مشورت و به‌تاملیکی معقولانه ایش ده‌کن تا له‌آخردا پشیمان وسرکردان نبن . منوران کرد اطراف کویسنجاق اربیل و ... اثره ایستا دعا بو (اوزدمیر) ده‌کن که به‌واسطهٔ او جتیه‌وه که ناردبوی و به واسـطهٔ او معاملات و تکلیفات نالایقه که درحق به کویسـنجق و جواری کردبوی بو به باعث انکشاف وهشیار بونه‌وه‌ی کردان و تأمین استقلال ملیمان .

بلی چندی له‌مه‌وپیش له تقرب او جته یه زور وطنپروان متأثر و متأسف بون فقط وکو خبرازانین ایستا همو منفرحن . [ و عسى ان تكرهوا شيئاً وهو خير لكم ]صدق الله العلي العظيم .

**مصطفی پاشا**



( پریشانی شیخ بزنی )

له نسخه‌ی پیشـودا بومباردمان دیهات شـیخ بزنی‌مان نوسـتی بو له پاش امه که پینج دی به‌تواوی بومباردمان کرابو ۳۰۰ سـوار له‌کرکوکه‌وه هاتبون او دیهاتانه‌یان سوتاند و له پاش امه بنا به افادهٔ توفیق آغای رئیس شیخ بزنی که ایستا تشریفی له سلیمانیه‌دایه دراوسیکان خویان یعنی عشیرت شوان چونه سریان‌بو تالان ٤٥٠ سر و قدریکیش رشه اولاغیان بردوه . بزانن له ام وقعه‌یشدا وله ام حال پریشانیشدا کرد به کرد مرحمتی نه‌کردوه خدا همومان اصلاح بکا .

---

دیسان طیاره

بنا به خبرانی که‌ووکیر اوه چنـد روژ له‌مه‌وپیش ۱۲ طیاره چون بو طرف رانیه وقت عصر که‌له‌اویدا سواره‌یکی زور عشایر موجود و له حال استراحتدا بون‌طیاره‌کان زور له‌نزمی‌یه‌وه به‌متراليوز بومباردومانی کردون به قدر ۸۰ اسپ تلف بون و تلفیات انسان به‌تو اوی معلوم نبووه انشا الله ایتر تکروی نابی .

∴

جناب عباس آغای محمود آغا

بنا به اخباری که شیوع کردوه رئیس عشـیرت پشدر جناب عباس آغای محمود آغا له ام روژانه دا بو

شـرفیابی له حضورجناب حکمدار دا تشریف اهینی بو سـلیمانی .

محی الدین افندی

مدیر شیخ بزنی ( زاب ) محی الدین افندی که له هنگام ام انقلابه‌دا له طرف اهالی شـیخ بزنی تالان کرابو امرو گیشتوته سلیمانی و دفتر ضایعاتی تنظیم و بو استردادی تقدیم حکومتی کردوه فسبحان الله ! انقلابات و سائر وقوعات بوچی بی به باعث ام نوعه معاملانه ، بوچی مأموریکی بی دسلات دوچار اذا و حقارت بی .

له مرکه‌یشـدا له طرف چند پشـدریکوه مدیر مرکه سعید افندی که شخصیکی خلوق ومحترم ومعروفه دیسان دوچار ظلم بوبو . و همو اشیای بیتیه‌ی تالان کرابو . کرچه ایمه ازاین رؤسای محترمهٔ میراودلی له قدیمه‌وه حظ به شقاوت و به ایش بی معنا ناکن فقط له‌برمرض نفاق که له‌بین کردانایه مع التأسف له اویشدا ام احواله ظهوری کرد .

استحضارات جنگ

عشایرجوان رو ، کوران ، سنجابی و کلهور وکو بیستومانه همو استحضارات اکن بو هجوم دوم بو سر هورامان سرئیس جانوسان طرف اولا تقریباً ۵۰۰۰ وطرف املا له‌کل متفقانی خویان تقریباً ۲۵۰۰ تفنکیان ده‌بی انشاالله مصادمه واقع نابی وخوین بی کناهان نارژی .

پاره ، پاره ، پاره

قربان بندکیفتم

پنجا سال له امه‌وپیش عولاشیته ناویکی سرقوتینه بو . خلق سـلیمانی اوشخصه یان به پیاوچاك نوعما به ولی دزانی که تصادفیان دکرد دستیان ماچ دکرد وبو تفأل خبر احوالیان لی دپرسی دیان وت قربان چی هیه چی نیه چی دبی بفرمو ؟ او زاته هیچ قسه‌ی تری نه دکرد له جواب زوورکـداهی‌دی‌وت پاره ، پاره ، پاره و له جواب بعضیکدا که خوی اوانه‌ی به چاك بهاتایه پیش چاو دستی دهینا به سریانا و دی وت چاکی اما برو . بعض صاحبان مراق بو غیب و بوتفأل بریان نه ددا و دیان وت قربان احوال شارکه‌مان چون دبی اسـلامتی زور ضعیف بووه ؟ اویش‌هر پی دکنی و دی وت بلی پاره ، پاره ، پاره .

حقیقت او شخصه تی‌کیشتو بووه . ایستایش زور شـیت وعاقلمان وا دزانم وربنه‌ی خویشیـان هر پاره ، پاره ، پاره دبی .

چندی له‌مه و پیش ذاتیك حکایتیـکی نقل فرمو وتی له‌زمان قدیمدا عاشور آغایك بووه دائما له‌کل ادعای پیاوتی و کوره‌تی که به تنها دمایه‌وه تنقید حرکات همو دوستان خوی دکرت و خلق وا اغفال دکرت که کویا عاشورآغا خوی زور ملیتپروره و هر مسلکی که‌اختیار بکه صرف بو منفعت عمومـه بو خوی هیچی ناوی . روژی له هندوسـتانه‌وه حکیمیکی عاقلی سیاح هاتبو و پرسیبوی که‌له‌بزرکان کرمانجان کی هیه چاوم پی بکه‌وی عاشورآغایان بو تعریف کردبو . بانی دکاته لای خوی به دوستی لی دپرسی تو له پیشـدا چی بوی وایستا چی دکه‌ی به من راستی بلی هرچه آرزو بکه‌ی من دتوانم بوت بکم و من پیاوی شهنشاه هند وچینم دساواستی بلی جناب آغا له‌جوابیکی دوور و دریژدلی راستت دوی من له وقت خویدا له‌طرف خاقین که‌شـاریکی قدیمی کردانه بوم له‌وی جمعیتیکم دبیـست هر ام کورانیانیان دوت ذکر شـو و روژیان هر امه بو واعرضت دکه‌م

منیش ا‌م‌ەم زور موافق بیینوه و هر مسلکی که اختیار
بکم هر قصه‌یکی زل که بکم هدفم هر او کورانیه‌یه :
قربان بند کیفتم تا پول داری رفیقتم .

سیاح دلی لەمە ئی‌نه‌کیشتم رجا دکم بەصراحت
بفرمو . عاشور آغا لەم وقتانەدا عاسیه خان رفیقەی
حیاتی بانك دکا صورت محاورەی بو نقل دکا عاسیه
خان دفعه بەبولەکەکەی خوی کە لە زور مسریەوه
هلو اسرا بو هینایه خووارەوه و بە کمال جدیت دەی
کرد بەکورانی : قربان بند کیفتم ......

سیاح وتی ایستانی کیشتم ایوه هرلەشوین منفعت ذاتی
خوتان دکەرین شهنشاه ایه و ای دزانی کە لە ارض
کرمانجدا هەمو بو ترقی وطن سعی دکن عجبا ای جناب
عاشور آغا اکر لە طرف ایمەوه کە ایمە دشمن بە ایوه
نامراوین چونکە ایوه روز پرست و ایمە دار پرستین
نقی بە تو بکا چونە ؟ لەجوابدا آغا دیسان فرموی :
قربان بند کیفتم — تا پول داری رفیقتم ! !

سیاح فرموی پس آغا حالی شدیم ! ! ایوه لەهر
طرفیکەوه نفسع ذاتیتان یعنی اقمه‌تان بو بی لەسر
بولتیقەی او طرفەن هر کسی اکرامیەتان بدانی
طرفداری اوەن و اأسفا ولات کرمانجان عجبا هەموا یه ؟
آغا لەکل رفیقەی هاو دلی بجاری وتیان اری اری
اری والله مدەیی بو لەقین ایوه اوز دمیرمان کرك بو
کە زانیمان بولی نەوو هاتینەوه خدمت خان دسمان کرد
بە بولتیقەو بەریا . تا بزانین چی دبی !!

---

جناب محمود خان دزلی

لە رؤسای مشهوران هورامی جناب محمود خان
دزلی لەکل آموزایان خوی علی محمد خان و محمد رشید
بك کوران جان‌الله بك و عبدالله بك سرتیپ . محمد علی
بك حبیب‌الله بك . محمد علی بك سردار بك لەکل قریب
بە صد سوار معیتیان بو شرفیابی زیارت حضرت
حکمدار کردستان وارد سلیمانی و لە خانوی عبدالرحمن
قپطانچی کە بویان احضار کرابو مسافر بون بەخیر بین .

---

جناب احمد بك ریشین

لەبکزادان ولد بکی جناب احمد بك ریشین ومخدوم
نجابت موسومی محمد علی بك و عمو زادەی محمد سعید
بك حسن بك ، وحسن و رستم بك کورانی مرحوم
یاراحمد بك لەکل جناب رشادتماب شیخ حسام‌الدین
افندی زاده شیخ محمد افندی بو زیارت حضرت
حکمدار تشریفیان هاتوەتە سلیمانی بخیرهاتن .

∴

حکایت منظومه

بحث مامور دور عثمانی
هەمو معلومە لای سلیمانی

نیك وبد هرچه بو اوا رابورد
شیر نما دو برا کە مانکا مرد

غایتی بحث اکم لە یك مأمور
وقت انکلیز کە تاوی داچو تنور

پیاوی قرضی دبی دچیتە شکات
حق چند سالەکی بدا کە نجات

دنوسی قبضەیك مدیر زمان
کە دبی بیتە لام فلان فلان

صاحب قرض دچیتە سرکابرا
قبضەکەیشی لە روی اوا دراخا

پیاو بچارە پی‌ی دلی ای یار
حق تو ثابتە بە بی انکار

نیه من عالمی بکم راضی
ضبطیه وتو ومدیر لەکل قاضی

بقدر حق تو دبی دیاری
بو مدیریش بیم نکا لاری
پیاو چابه رفیق به توبی خدای
حق خوت ورگره و مجوره‌وه لای
مسئله حل و فصلیان کرد زو
لیك ترازان به دلخوشی هردو
کاوه‌ی بیست مدیر دلی ایشا
ضبطیه‌ی ناردو کابرای کیشا
وتی بوچی نهاتی اول جار
وتی ایش حل کرا به‌بی انکار
وتی تو خائنی نفام و منال
بده صد روپیه و بچوره‌وه مال
رق زور بو مدیر جریمه‌ی کرد
نك جریمه که قیمه قیمه‌ی کرد
امه بو حال اسبق و سابق
خوا بکا وا نه‌بی ایتر لا حق

زیور

---

جناب میجر نو یل

وکیل مندوب سامی جناب میجر نو یل پیری به طیاره دیسان چو بو کرکوك حاکم سابق جم‌جمال کاپتن چیمن بو وکالت اوهاته سلیمانی .

---

[ بانگ کردستان ] ك ترکجه قسمی :

حقیقت کردستان

مابعد

مرحوم سعدی شیرازینك گلستان نام اثرنده‌کی — دانی که چه گفت زال با رستم کرد — مصراعنده پهلوی سرامداننددن اولدیغنه شبهه اولمیان رستمدن بحث ایدرکن کردی کاف فارسی ایله سویلشدر .

میلاد عیسی دن تقریباً درتیوز کسور سنه اقدم یونان مؤرخلرندن مشهور کسه نوفونك اردوسیله بابلدن نینوا ، دیاربکر ، خربوط جهتلرندن شماله طوغری رجعت ایدرکن شمالی کردستانده مستقل بر قومدن بحث ایدرك اوراده‌کی قومی کاف فارسی ایله کردی کلمه‌سنه تماماً شبیه کردئامینه ذکر ایلمش که قوم

مذکورك شمدیکی کردستان اهالیسنك سکنهٔ قدیمه‌سندن اولان کرلردن و کردستانده‌ی بو قومك اوته‌دنبرو مسکون اوله‌گلدیکی قطعه‌دن عبارت اولدیغنی اکلاشیلیر .

........................

جنکیز زماننده کرد اسمنك محترم ومحفوظ اولدیغی
وجنکیزلرك استیلای مشهوری صره‌سنده بیله
کردستانك مختاریتله اداره ایدلمش اولدیغی

مشهور جنکیزك بتون ایرانی استیلا ایتدیکی دورلرده آغری — آرارات — طاغندن بصره کورفزینك هرمز بوغازینه قدر شمالدن جنوبه ممتد اوله‌رق شرقدن غربه و غربدن شرقه چکمکه مجبور اولاجق برمسـ - ایشته بتون کذرگاهنده‌کی چکیدلری حاوی مناطق مهمه‌ده متوطن کوردیکی شجیع اهمیتلی کرد قومنی رنجیده ایتمیه‌رك سیاستاً حسن اداره‌لرینه موفق اوله بیلمك ایچون کردستان اقوامنه تعیین ایتمش اولدیغی بکلرك کرت ( کرددن غلط اولملیدر ) اسمیله تواریخ قدیمهٔ فرسیه‌ده مذکور اولمسی هم ادعای واقعه‌مزی هم‌ده جنکیز کبی برجهانکیر جبارك نظرنده اهمیتی تقدیر ایدیلان کردستانك مدبر اداره‌لری کندیلرندن اولمق اوزره مختاریتله اداره ایدلمش اولدیغنی تأیید ایدر .

مابعدی وار

---

اعلانه

٣٣٨ — ٢١١

او خانوه که له‌محلهٔ گویژه واقعه وطرفیکی به‌ریکا و به خانوی رشید و فتاح و حاجی ابراهیم افندی محدوده وخانویك له‌کل رز دیم که‌له‌دی ویله‌در واقعن به اعتبار ٤٨ سهم ١٤ سهمی عائد به عارف کوری عبدالرحمانه لبسانی چل لیرا ماره‌یی حلاوه خان کچی احمد بك حجز و فروشتنیان قرارگیربوه بناءً علیه بو احالهٔ اولیه‌ی تا ٣٠ روژ وضع به‌مزایدهٔ علنیه کرا هرچی طالبه صدی ده تأمینات مستصحباً مراجعت بدائرهٔ اجرای سلیمانی و منادی توفیق آغا بکات .

١٠ تشرین اول ٣٣٨   مأمور اجرا
م . وهبی

---

له‌چاپخانهٔ حکومت له سلیمانی هچاپ کرا

صاحب امتیاز و مدیر مسئول
و سر محرر
مصطفی پاشا

اعلانات بدیریك
۳ آنه ده سیتریت

بو همو شتیك مراجعت
به صاحب امتیاز اکری

# بانگ کردستان

تحریر. کردی و فارسی
۴ چال و م ۰ نوری

بوداخل شهر ولوا بدل آبونه
۳ مانك دو ٦ مانك چوار
سالیکی ۸ روپیه یه

بوخارج اجرت پوسطه
علاوه دەکری

(زمان کوردزو وم رابوردو ایستا پالوان علمه)
( سلاح دسته صنعت بارقهٔ تیغ وسنان علمه )

تاریخ انتشار
۲ آغستوس ۱۹۲۲
سلیمانی

علمی ، اجتماعی ، ادبی ، غزتەیکی حر و سربست ملی یه
هفتهٔ جاریك دردچی
نسخه یکی به ۲ آنه دەفروشری

سال ۱　ژماره ۱۲　[ جمعه ]　٥ ربیع الاول ۱۳٤۱　۲۷ تشرین اول ۱۹۲۲

ارادهٔ حکمداری

عـدد ـــ ۳

۲٤ صفر ۱۳٤۱　۱۵ تشرین اول ۱۹۲۲

پایتخت حکومت کردستان له سلیمانی دا نوسرا
ارادەم کرد به ایفای موادآتیه

۱ ـــ بالعموم رؤسا هفتهٔ دو روژ دوشنبه و پنجشنبه پاش نیوه رو ساعت له هشته وه تا ساعت ده ابی له دائرهٔ خصوصی خومدا اجتماع بکەن بوعرض و حل مسائل مهمه و امورحکومت .

۲ ـــ له احوال فوق العادەدا وعند الحاجه هر رئیسی وله هر وقتیکا حقی ملاقاتی لەکل مندا هیه .

۳ ـــ بالعموم رؤسا له خصوصات آتیەوه ابی ترتیبات وتنظیمات دوائرخویان علی العجله اجرا بکن .

ا ـــ منتظماً وکوماکینه دوام کردن لسر وظیفه .

ب ـــ حرکت کردن له هر جهتیکەوه به موافق پروغرامیك منتظم بی کـه رئیس دائره ترتیب کردبی .

ج ـــ تنسیقات به موافق احوال وواردات مملکتەکه

د ـــ له هر دائرەیکا الغای وظیفهٔ معاونیتی .

هـ ـــ ترجیحاً استخدام کردن ارباب صـداقت عفت و استقامت .

له پاش ترتیب وتشکیل ام نوعه. اجرا آتانه ابی جداول و اوراقی تقدیم بکری .

٤ ـــ به انتخاب و ترتیب عموم رؤسا ابی بوهمودائرەیك ترتیبات آتیه اجرا و بعده عرض تصدیق بکن وله پاش تصدیق اعلان بکری وکوقانون .

ا ـــ بوعموم دوائر ملکیه و عسکریه قادرونامەیکی منتظم ومفصل .

ب ـــ درست کردنی لیستەیکی معاشات عمومیەکه لەنفرەوه هتا ناظر همو رتب و وظائف عسکریه و ملکیەی حاوی بی و بەموجب قادروکه بکری .

ج ـــ لەهردو جهتەکەوه احوال واردات ولیاقت مملکتەکه اساس اعتبار بکری .

٥ — تقسيم وظائف و درجهٔ صلاحيت مقامات عاليهٔ حكومت بروجه آتى نوسراوه .

ا — رياست الرؤسا — حق نظارتى بهسر عموم رؤساوه هيه . و رؤسا له هر امريكى مهمدا مجبور استشارهٔ اون . رياست مجلس رؤسا به خوى عائده .

ب — سپهسالار . بالعموم مسائل حربيه وعسكريه راجع او مقامه‌يه .

ج — رياست داخليه . بالعموم متصرف قائمقام ومديريتهكان ومتصرفيتى مركز ، بلديه وطابو له زير صلاحيت ام دائره‌دايه وموقتاً دائرهٔ صحيه‌كه عبارته له خسته‌خانه .

د — رياست معارف . بالجمله امورمعارف وهر چى ترتيباتى كه‌ايجاب بكات لم خصوصه‌وه راجع به‌رياست معارفه .

هـ — رياست نافعه . طرق ومعابر ، پوسته وتلغراف مهندسخانه و اعمالاتخانه ، اورمان وزراعت راجع به رياست نافعه‌يه .

و — رياست شرعيه وعدليه . بالجمله محاكم شرعيه وعدليه محاكم صلح ومحاكم منفرده ، استيناف ، تميز دائرهٔ اوقاف بغيراز وقف اطعام مساكين راجع ام رياسته‌يه .

ز — رياست امنيت عموميه . محافظهٔ داخل دوائر پوليس و ژاندرمه و دوائر استطلاعات يعنى مركز و ملحقات حكومت كردستان عائد ام رياسته‌يه .

ح — مفتشى عمومى حكومت . لهسر بالجمله دوائر و مقامات حكومتدا مانكى دفعه يك حق تفتيش و له ام خصوصه‌وه صلاحيتى پى بخش كراوه و عند الاقتضا به‌اراده عليه له‌هر وقتيكا حق تفتيش هيه .

ط — رياست ماليه . بالجمله امور ماليه . حكومت و خزينه راجع به رياست ماليه‌يه .

٦ — له‌پاش اعلان و تعميم ام اراده‌نامه‌يه هرچى اصول و ترتيبات كه له سابقه‌وه مرعى‌الاجرا بوه منسوخه .

٧ — بالجمله مأمورين له نفردوه تا ناظر أبى جهتيكه‌وه به قدر ذره‌يه تكاسل و عجز له وظيفه خويان نهينن و ادنى خطايك و يا مسامحه‌يان و ياخود بى‌قانونيك له هر كسيكه‌وه كه ظاهر .. وياخود درك بكرى بلا تفريق مبتلاى اشد جزاى اكم و عبرت العالمين انواع مجازات شديده له حقيا اجرا اكم .

٨ — هر مأمورى بلا تفريق درجه و مقام ابى خويان به خدمتكار ملت بزانن وله كل هر فرديكى ملتدا أبى به حلم و مسالمت و نزاكت معامله بكن ادنى دل شكينيك غير قانون موجب عقوبات أبى وهر نوعه خدمت وملايمتى بو جلب و تطييب خاطر افراد ملت اجرا بكرى . فقط تكرار ايقاظ اكم كه له‌قانون به‌در نه‌بى .

حكمدار كردستان
محمود

صورت ارادهٔ عليهٔ جناب حكمدار كردستان
عدد — ٤

۳۰ صفر ۱۳٤۱      ۲۱ تشرين اول ۱۹۲۲

پايتخت حكومت كردستان له سليمانى دا نوسرا

ارادهم كرد مصطفى بك عبدالله عثمان پاشا به تعيين كردنى بو مديريت فوق‌العاده به مانكى ۳۰۰ سيصد روپيه بو ناحيهٔ پنجوين له‌براخذ تعليمات و اوامر لازمه سريعاً ابى مراجعت به رياست داخليه بكرى .

حكمدار كردستان
محمود

— مناجات —

لەگل تو عهـد دل یارب کەعصیان قط نکەم ایتر
دسـا وك عهـد قرأنت بکە توبەم قبول ایتر

من رو رش بە غـیر از معصیت هیچم نیـە اما
امیـدم تو غفوری سـا دەبی عفوم بکەی ایتر

ریضا معصیت کردن لە بی ادر اکی یە بە خدا
لە تو معلومە ام ایشـە بە حالم مرحمت ایتر

لە دلدا خوف تو موجودە نفسم ظالمە یا رب
بە رحم خوت خداوندا بکەی اصلاح من ایتر

درزانی (مصطفی) یارب عذاب تو دەبی هر بی
فقط کی بی لەتو پرسی اگر عفوم بکەی ایتر

اشتعال متأسف

نزیك بە استاسیون کنگربان لەشمندوفردا اشتعالیکی عظیم روی داوە نظر بە مسموعات زور نفوس و اموال تجاریە وقسمیك تونی سلیمانی هموحترق ونابود بووە .

کە ام خبرە گیشتە سلیمانی ( حضرت حکمدار ) کە بە عهد و وفا معلومە بو استفسار خاطر اهالی صلاحیە وکنگربان بە تلغراف لە جناب سیدمحسن آغا بابان زادە جمیل بك افندی استیشار عافیتیانی فرمووە .

خدا هموحکمداریکی بە شفقت و بە وفالە سرسریر حکومت وشوکتیا برقرار بفرموی .



بومبا و ضایعات

نظر بە استخبارات مخصوصە لە کرکوکەوە چند طیاردیك چووەتە سر مرکە و قلعە دزە و اطراف رانیە لە تأثیر بومبا لە نفوس و حیواناتدا ضایعاتیکی متأسف بووە اهالی او ناوە بە روژ التجا بە شاخ و کیو و اشکوتان و بە شو بعضیکیان بو مالە کانیان عودت دەکن .

روایت لەاو کسانە کەلەاو اطرانەوە هاتون دلین لە طیارەکانەوە لە پیش بومبا هاویشتنا بیاننامەیکی زوریان هاو یشتووە و بە اهالییان تی گیاندوە کە ای اهالی بچن تبعیت و اطاعت بە سلیمانی یعنی بە حکومت علیـهٔ کردستان بکەن واز لە اختلال و عصیان بهینن هتا ایوەیش لە تأثیرات بومبا و طیارە امین بین .

خدا قریباً آسودەکی بە کردان وقوت و انتظامیکی تام بە حکومت کردستان بدا تا لەمەولا حوادثات وها متأسفە نەبیەین و نە نوسین .

تعیین و تبریك

لەبکرادان محترمهٔ جاف جناب مصطفی بك عبدالله پاشـا کە بە نزاکت و حسن خلق مشهورە و بە درایت و کیاست کافیە معروفە ام جارە بە ۳۰۰ روبیە معاش بو مدیریت فوق‌العادهٔ پنجوین تعیین کراوە . اهمیت و نزاکت پنجوین چونکە معلومـە تعیین فرمونی ام ذات مقتدرە حقیقت بەجایە خدا توفیق بدا و بانك کردستان بە جان و دل تبریکی دکا .

نخوشی اجتماعی و چارهٔ تداوی

هرچند تأریخ ملل اسلاف کتب اعصار پیشـو بکم بو ملیت دوروا نزك زمان وا خطرناك نابینم چونکە دول اوروپا و امریقـا لە مذاکرهٔ امەدان بەکام ملتی حاکمیت بدری یاخود بومحافظهٔ حقوق ملیی امتیازیکی مخصوص پی بدری لەگل امیش زور کس هیە کە مقید بەقید وطنپروریەوە دلسوز بومنافع عمومیە نیەای وطن هموبی گیشتوی تو حیفا کەهاو فکرنین و لە ام وقتە نازکەدا کوششیکی بەراستیان دیار نیە .

عجبا ملتیکی خستە وبیمار چاکردنەوی چون قابلە ؟

باعتبار خاصیت اونده مسئله‌یکی تأریخیه و قضیه یکی روحیه‌یه‌که لیوهاهینانه‌وه له‌م مسئله‌یه متوقف جرأت و جسارتیکی عظیمه .

له‌قرون متقدمه‌دا یونانستان له‌ریزی مال مستقله‌دا نه ده‌ژمیررا بالعکس له‌طرف دول مختلفه‌وه به ناوی ایالته‌وه اداره اکرا . لپاشا به واسطهٔ اتحاد خویانه‌وه بو به‌حکومتیکی وا که ایستا کاه کاه استیلای استانبول خایا دکا .

بلغارستان ، صربستان زور له‌مه‌و پیش له‌موجودیت سیاسیه وداعیان کردبو کچی امرو زور چاك هر یکی له‌شکلی عضویکی ملیه‌دا و له‌اهنگیکی دوایدا منجلین .

دانیمارقه . وتت خوی له‌حوالی شمالیه‌دا دولتیکی زور گوره بو همو بالطبع تابع امری بون . لم عصر اخیره‌دا پروسیه شله‌زویغ ، هولشتاینی لی‌سند له‌گل امه‌شدا چونکه به معارف و مدنیته‌وه مربوط بون وضعیتی خوی هر محافظه کرد .

بلچیقا به‌ام بچوکی خویه‌وه له ام حرب عمومیه‌دا له‌ژیر استیلای الماندا له‌داخلی خویا حکومتیشی نما فقط چونکه قومیکی متحد و منجلی بون دیسان خویان کرد کرده‌وه ایستا دول معظمه جوی جوی آرزوی یکتی او ده‌کن .

جمهوریت لهستان لپاش او ۳ تقسیماته عظیمه که بسریا هات به‌کلی له‌جدول مال مستقله دزهاویژرا له پاش ام همو فلاکته عظیمانه دو باره حیاتیکی ملیتی تازه‌یان ورگرته‌وه خویان کوکرده‌وه امرو له‌ناوه‌راستی اوروپادا له مجادلهٔ حیاتا احراز ظفر اکن . ایمه‌یش انشاالله له سایهٔ همت بلند ام حکمدار با اقتدارمانه‌وه روژی دیت ناومان له ناو حکومت متمدنه‌دا عکس انداز دبی . خدا نکرده له حکومت ، له حاکمیت محروم بین قطعیاً ناتوانین حقوق ملیه‌ی خومان محافظه بکین . چونکه بم جهالته‌ی اکثریته‌وه اگر حکومتمان نبی بی‌شك ملیتمان رو له اضمحلال دبی .

ناتوانم قصه نکم دماغ و اعصابم سکوت قبول ناکات بو افاقهٔ ام نخوشیه بو اوهٔ احوال امه توزی له مال سائره بچی لازمه بگه‌رین درمانی بدوزینه‌وه اگینا اگر هر بوتشکیل قومیته وبو ادعای ماموریت وبو منفعت پرستی سعی بکین اومانانه او امره عظیمانهٔ تأریخیه یعنی زندوبونه‌وی اوملته مردوانه که له‌سره‌وه موضوع بحثمان کرد بو ایمه غیر قابله . دراوسیه‌کانمان بو ام کردستانه همو چاویان داپچریوه . انتظار مان اکن . بو رفع و سلب اشتهای امانه محتاج و حرکتیکی متحدانهٔ ملیه‌ین . اگر سعی بو بقا و دوامی ام حکومته نکه‌ین استقبال ملیتمان مشلوکه . عجبا نازانن که ملیت حاکمه چند خوشه ؟

تماشای اوملتانه بکه‌ین که دوچار فلاکت بون له احوالیان ورد ببینه‌وه امانه به‌چی برز بونه‌وه . غیرت ملیه به‌چی خبری ابیته‌وه وجدانیکی ملی چون ترکب و تشکل اکا .

ابو بعث بعدالموت ملتیك تعمیم چه نوعه حسیاتیك لازمه ؟ ملتیکی نوستو چون خبر ابیته‌وه ، بو قومی که دوچار خه‌ویکی ابدی بوبی چه نوعه تدابیری لازمه . امانه‌یه .

ام جهتانه لازمه له مجالسدا و له‌ناو پیاوه گوره‌کانمان موضوع بحث بکری و له همو جیگایك غیبت ترك بکری طبقهٔ علیا ، ارکان ملت ، صنف ممتاز ، له‌بحث ام مجبوریته دان که هتا زوه ام مسئلانه بخنه موقع مذاکره‌وه .

رجال وطن و مملکت خوا اگر مسلکیان هر شخصیات و غرض پرستی بی خدا نخواسته له جی ی ترقی تدنی‌یه !

خلاصه فکرمان دایما ابی مربوط استقبال بی استقبال متمادیاً له دماغمانا ابی جیگای مخصوصی بی و الا هر وکو هیوبین دمینینه‌وه .

---

## مطبوعات و صداقت

قومی له‌م زمانه دا معارف نه‌بی و بوترجمان افکاری و اعلان موجودیتی وبو مستخبرات له یار و اغیاری مطبوعاتیکی غزته‌یکی حری نه‌بی او قومه او ملته پی ی نالین قوم مدنی پی ده‌لین بدوی که له جهان مدنیتدا نه حرمت واعتباریکی ده‌بی ونه به قول وفعلی بروا ئکری .

هر قومی بلی محترم و آرزوی ترقی بی مطبوعاتیشی روزنامه یشی دەبی سربست بی له ژیر قید ریادا نبی بو بیدارکردنی افراد ملت هرچه لازمه تیا بنوسری بو تمدح عمرو زید که نورسیدکان ملت نوری ریا و آخری اوقومه له ژیر بار استبداد وتدنیدا بربا ددکا ، ستون مخصوصی نبی ولی بو تحکیم و تثبیت حکومتیکی عادله له نظر یار و اغیاردا حرکات و اجرآت مشکوره و اقوال پسندیدهٔ رئیس قوم و بزرکان دائما نشر و اعلان بکری امه فائدەی انکار ناکری و الا فلانه کس هات امەیه اوەیه فیدارەکس روبی ماشاالله وهابو وهایه و وکو له محض جیکایان نەبه بوفائدهٔ شخصی غزته برکن له درو و له ریا . امه چاك نیه بەوه ملت دلخلاناندن دەبیژری . ریاکاری دوبژری . فقط کسی که بیته شار به واسطهٔ مطبوعاتەوه یاخود بطرزیکی تر که مطبوعات خبرداربی جوانمردیك بنوینی مثلا اعانەیکی بو مدارس و مکاتب دابی ، عائلەیکی فلاکتزدەی احیاکردبی یاخود له مرحق آزابیکی مشروع عدالتیکی مقبولی بجی هینابی بو مدح اوه غزته بزبان راست کوبی خوی به همو لایکدا هاوار و وظیفهٔ خوی اظهار و به افتخار دکا فقط تا ایستا نماندی رایه یش نانوسی ! ذم اشخاصیش حظ لی ناکەین اگر معتادمان بو وایه به صردی انف با تا ایستا چند مؤلفاتیکمان دبو !!

دیسان باین ولی ولی وکو ایستا له همو نسخەیکی غزتەکانماندا ذکر و بیان کراوه چشتی که بو حکومت و ملت مضر بی و له مملکتدا له طرف چند کسانیکەوه قصدی ویاخود لەبر بی مغزی اعتیاد کرابی نه به رنك شخصیت بلکو به نوع اخطار و نصیحت نوسراوه و دنوسری امیم اوانەی که له مانه خالی بی و حسن نیتی بی لەم نوعه نوسینانه نابی دلگیر و متهور بی چونکه بالفرض مباحثاتیك که له لای اربابی بونی شخصیتی لیوەبی محکمه حاضره رای شکایت نەبستراوه له سایهٔ حضرت حکمدارمانەوه حقوق همو کسیك دپیسریت و دپرسری .

مسلك و مقصد ایمه له قدیمەوه معلوم یار و اغیاره بو محافظهٔ حقوق پادشاه اسلام له استانبولدا تنها من بوم که مقابل همو جمعیت به قوت اتحاد و ماصوندا و له مقابل او اغیاردا که صرف بو شکاندن شان و نفوذ خلافت معظمهٔ اسلامیه ام همو مسألەیان احداث کردبو و ایستایش مشنوان هر دەیکن توانیم و نیسانم کرد تا او روژه که له پایتخت خلافت مع التاسف مفارقتم کرد به قدر ذرەیك خلاف امر و فرمان ذیشان سلطان اعظمم نەکرد و بەم نوعه نعمت عثمانیم بخوم حلال کرد و به صداقت خاندان محترم حضرت سلطانم ممنون کرد . فقط چونکه زانیم کردستان له موقعیك و زمانیکی نازکدایه و دمزانیش که اگر سیاستیکی زور دوربینانه عاقلانه و عاجلانه نەبی بو کردستان زیان له خارج امکانه به امیدیکی عالی هاتمه وطن ناو کردان ! وهموکس دزانی که لەو روژەوه واصل عراق بوم هر بو کردایتی هر بو هاتنەوەی حضرت ، هر بو تعالی خاندان محترم حضرت حکمدارم سعی دکرد حق زور دفعه انکلیزەکان بمنیان دووت نازانم تو بوچ ونده حظ به هاتنی جناب شیخ دکەی ! او وقته زور کسان هر بو لقمه سعیان دکرت ناوی شیخانیان بزباندا نه دهات من مسلکم هر او مسلکیه هر او پیاوەم دست و قلمم ناگوری اوانەی که له قصەی راست کرژ دبنەوه و دکروزینەوه امەیان بو دنوسین به یادکار :

دار هابره ........ دیاره و السلام .

**مصطفی پاشا**

## حضرت عالی حکمدار کردستان

**حضرت حکمدار کردستان که بو شکار تشریفی بردبو بو مرکز قضای شهربازار روژ ۲۲ تشرین ل ۳۳۸ عودتی فرموده .**

سیادتماب جناب شیخ عبدالله افندی عسکر له کل جماعتیکی محترمه‌و له مشایخ معروفه جناب شیخ غفور له کل برادر مکرمی شـیخ قادر بو زیارت حضرت حکمدار کردستان وارد سلیمانی بون .

---

معلم ریاضی اعدادی سـلیمانی رفیق حلمی افندی با ارادهٔ علیهٔ حضرت حکمداری به دو صد و پنجا روپیه معاش بو مدیریت اعدادی محمودی و رشید زکی افندی مدیر سابق نمونهٔ سـعادت به صد و پنجا روپیه به معلم اول مکتب رشدیهٔ قادریه تعیین فرموراون .

تعبیر مدیریت هر بو اعدادی ماوه . تشکیلات تازه‌ی معارف درحق به مکاتب له نسـخه‌ی آتیه دا دنوسری .

---

رئیس عشیرت پشدر جناب عباس آغای محمود آغا

رئیس عشیرت پشدر جناب عباس اغای محمود اغا به قد سیصد سواره‌وه و له‌خزمانی خوی جناب بایز اغا و بیروت اغا و خضر اغای کوران حاجی رسـول اغا و بابکر اغـای خضر اغا و کلاوی اغا و باپیر اغای بابکر اغا و اغای قرەنی اغا و احمد اغـای جوامیر اغا و قادر اغای مصطفی اغا لکل جناب شیخ امین سپیداره بو زیارت حضرت حکمدار تشریفیان هاتوته سلیمانی .

ام ذوات کرامه به استقبالیکی تام داخل شار بون عرض بخیرهاتنیان ده کهین .

---

وکیل مندوب سامی جناب میجر نوویل ۲۳ تشرین اول ۳۳۸ له کرکوکه‌وه بو سلیمانی به طیاره‌وه‌ دتی کردوه و له کل کابینه‌کان جیمن بشرف زیارت حضرت حکمدار مشرف بون و ایواره بو کرکوك دیسان به‌طیاره روبه‌وه .

---

### عفتماب حمیده خانم

له نسخهٔ پیشودا بو جنك دفعهٔ دوم استحضارات طرف سردار رشید جوانرو( شـرف‌الملك سـلیمان خان زاده‌یه) و هورامی جناب جافرسان نوسـرابو . نظر به استخبارات تازه له سایهٔ همت مشکورهٔ جناب حمیده خانم که حرم محترمهٔ سردار رشیده له بین هردو فرقه‌دا صلح کراوه و الحمدلله مصادمه و مقاتله نبوه . انشالله له‌مه‌ودوا له نارهمو عشایردا له پیاوان وله خانمان دا ذوات صلح پرور همت افرمون تا له بین برادران ملت‌دا اختلاف و منازعات برطرف بکری .

---

### آسایش داخلی

له مرکز حکومت کردستان یعنی سلیمانی دا له سایهٔ همت و عزم اولوالامره‌وه له الحمد آسـایش و امنیت تواو هیه و له اطرافیشـدا ذیسـان اختلافات روی به دوستی کرتوه ام حاله بو همو کردان موجب شکرانه .

---

### اعلان

نومرو — ۲٤

له محلهٔ درکزین نصف خانویك كه ملك آمینـه کچی ملا غفور بوه ارثاً بو امین و عبدالرحمن کوران حاجی حسـن و قادر و غفور و رعنا و خدیجه اولاد درویش احمد و سلیمان آغا پسر عزیز موروثه اسـمر مراجعت سـلیمان آغا طلب ازالهٔ شـیوعی کراوه و اصولاً له دائرهٔ طاپووه اخباریه بعدالتنظیم به قادر و غفور و رعنا و خدیجه تبلیغ کراوه لسر درکنار مختار محلهٔ مذکوره لو ورثه‌یه امین و عبـدالرحمن کوران حاجی حسـن محل اقامتیان مجهوله بناءً علیه بو کرینی حصهٔ سلیمان آغا اگر طالبن تا مدهٔ ۳۰ روز تر مراجعت به دائرهٔ طاپوی سلیمانی بکن .

۱۹ تشرین اول ۹۲۲		مامور طاپو : فایق

---

له مطبعهٔ حکومت له سلیمانی طبع کرا .

صاحب امتياز و مدير مسئول
و سر محرر
مصطفى پاشا

اعلانات بديريك
٣ آنه ده سيتريت

بو همو شتيك مراجعت
به صاحب امتياز اكرى

محرر كردى و فارسى
جمال و م ٠ نورى

بو داخل شهر ولوا بدل آبونه
٣ مانك دو ٦ مانك چوار
ساليكى ٨ روپيه يه

بو خارج اجرت پوسطه
علاوه دەكرى

# بانگ کردستان

(زمان گورزو رم رابوردو ايستا پالوان علمه)
(سلاح دسته صنعت بارقهٔ تيغ وسنان علمه)

علمى ، اجتماعى ، ادبى ، فنه يكى حر و سربست ملى يه
هفتهٔ جاريك دردچى

نسخه يكى به ٢ آنه دەفروشرى

تاريخ انتشار
٢ آغستوس ١٩٢٢
سليمانى

سال ١ ژماره ١٣ [ جمعه ] ١٢ ربيع الاول ١٣٤١ ٣ تشرين ثانى ١٩٢٢

## حضرت حكمدار معارف پرور

له او روژەوه كه حضرت حكمدار كردستان تشريفى مباركى هيناوەته سليمانى شو و روژ بو آسايش داخلى و امن و استراحت اهالى سعى فرمووه فقط له همو شت زياتر چونكه كردستان احتياجى به معارف و تا ايستا حقيقتاً له محيط سليمانى دا مكتبيكى موافق و تشكيلاتيكى مناسب نبووه و له اصول تدريسدا تا ايستا كس مشغول نكراوه . حضرت حكمدار ولك بو دوايرتر ارادهٔ فرموبو ؛ بومعارفيش تشكيلاتيكى چاك و مستعجلى اراده كردبو . له سر امه له طرف رياست معارف كردستانەوه له نفس سليمانى دا له ژير ادارهٔ مدير رفيق حلمى افندى كه حقيقتاً له اذكياى شبان وطنه مكتبيكى اعدادى حوت صنفى (٣ صنفى رشديه يه) به ناو مباركى حضرت حكمدار يعنى (اعدادى محمودى) و مكتب رشديه يكى جوى به ناوى جناب سپهسالار شيخ عبد القادر افندى يەوه يعنى (رشديهٔ قادريه) و دو مكتب ابتدائى بەناوى مخدومان حضرت حكمدارەوه (رؤفيه) و (لطيفيه) تشكيل و بەو نوعەيش بو نام نزانيان مساعده فرمورا . حقيقتاً ام اراده و همت عالى يه بو عموم كردستان موجب شكران و امتنانه و به سبب ام تشكيلات مستحسنەوه له طرف همو معلمان مكتبەكان مضبطه يك تشكر و دعا بو حضرت حكمدار كه نيرراوه بو ادارهٔ بانك كردستان عيناً اوا له ژيرەوه درج كرا . و بانك كردستان به زبان صداقت عرض تشكرات له خذمت حضرت حكمدار معارف پرور دكا .

صورت مضبطه

بو مقام سامى رياست معارف تقديم

به واسطهٔ تصديق تشكيلات تازى معارفەوه حسيكى علوى كه حضرت حكمدار كردستان دام شوكته درحق به مكاتب لطفاً و تنزلا ابرازى فرمووه حقيقت مافوق همو حسيكى عالى يه . ايمرو له سايهٔ ارادهٔ و فرمان اعليحضرت حكمدارەوه تشكيلات مكاتب موافق

اصول و نظام معارف جیکایان ئرو ترتیبات تازه یه ا
سزاوار تقدیره بالخاصه انتخاب رفیق حلمی افندی که
له‌اقتدار و فعالیت و وطنپروریدا معلوم همو ملت کرده
موجب تقدیر و شکران کافهٔ هیئت تعلیمیه یه . له سایهٔ
غیرت مدیر مومی‌الیه‌وه لظرف ام چند روژه‌دا له مکتب
نظام و انتظام تحصیل و تربیه به فعالیت و فدکاری یکی
تام ابراز ده‌کری . عموماً له مومی الیه راضی و له مدیریتی
خوشحالین اقتدارشی معلوم همو لایکمانه . بناءً علیه به
واسطهٔ مقام‌سامیه‌وه بوخاکپای حضرت حکمدار اعظم
رفع تشکرات ناچیزانه ده‌که‌ین افندم .

معلم اعدادی محمودی کذا	کذا	کذا
صالح رفعت	سعید صدقی	زیور	احمد حمدی

معلم اعدادی محمودی	معلم اعدادی محمودی	کذا
محمد رمزی	سعید ادیب	محمد زهدی

معلم اول رشدیهٔ قادریه	معلم رشدیهٔ قادریه	کذا
سعید زکی	عبد العزیز عثمان	عبد العزیز

معلم اول ابتدائیهٔ رؤفیه	معلم ثانی ابتدائیهٔ رؤفیه
سید عاکف	احمد

معلم اول ابتدائیهٔ لطیفیه . احمد حمدی

§

ورقه‌یکی وارده عیناً درج کرا :

روژی ٥ ایلول ٩٢٢ که مامورین سیاسی حکومت
بریتانیا بنا به امریك که وریان گرتبو له سلیمانی
رویشتن و عموم امور ادارهیان تودیع به جناب جلالتماب
شیخ عبد القادر افندی کرد خاص و عام دیان‌وت که
ایتر امنیت و آسایش له کردستاندا نابی .

کاروان ناتوانی آمد و شد بکا ، ریکا و بان
اگیری ، انواع قتال و شورش رو ادا . لله‌الحمد خلاف
تصور ام خاقه له زمان سابق و اسبق باشتر بو تدویر
امور حکومت جناب مشار الیه شیخ عبد القادر افندی
صرف همت و مقدرتی فرمو . و اهالی و عشایر له‌بر
امه‌ی که له قدیمه‌وه منسوب خاندان طاهرهٔ حضرت
حکمدار اعظم کردستان و له حقیقتیشدا همو وقتی
عشایر کردستان به صفت پیاوه‌تی و صلح و مسالمت
متصف و علی الخصوص همو به حس ملیت متحسس
اوانیش بو انتظام و محافظهٔ آمد و شد [illegible] و
ریکا بذل مقدرت و غیرتیان فرمو .

له او مدته‌دا هتاوکو حضرت حکمدار ذی شوکت
کردستان تشریفی واصل سلیمانی بو له سایهٔ خداوه له
داخلدا به قدر ذره‌یك بی انتظامی روی ندا و له
خارجیشدا له جاران زیاتر امنیت و آسایش بینرا و
مشاهده کرا . که امه دلالت له تنویر افکار ملت اکا
و بو ترقی و تعالیمان نشانه‌یه .

له پاش تشریف هینانه‌وهٔ حضرت حکمدار
کردستان دام شوکته ایترملت کوته حال رفاه و
استراحتیکی وهاوه که امثالی نبینراوه — وهروکو له
نسخهٔ ( ١٠ ) بانك کردستاندا نشر کرابو بو دس کردن
به ایش و انتظام امور کردستان هیئتی رؤسای محترمه
با ارادهٔ علیه تعیین فرموران تعیین فرمونی ام هیئت
رؤسای محترمه یه که له ذوات ذی اقتدار و زمدار
حل بژیرراون تشکیلاتیکی موقتیه .

هتاوکو جناب مندوب سامی دولت فخیمهٔ بریتانیا
که له بغداده هس وکو وعدی فرمو وه موافق خریطه
عموم لوا و قضایان کردستان الحاق افرمویت اوسا به
ارادهٔ حضرت حکمدار دام شوکته له کرکوك و اربیل
و له زاخو و عقره و عمادیه و دهوك وصلاحیه و خانقین
و سایر بلاد کردستان رجال محترمه دعوت وتشکیلاتیکی
دایمی اجرا اکری امیدمان هیه انشاالله اوق مایتصور
ام کردستانه‌مان اه‌به حکومتی که‌روحانیت حکمداران
پیشوی کرد شاد بی و له صفحهٔ تأریخدا هتا دنیا آخر

دەبی ام ناوە گورەیە حکمدار اعظم کردستان حضرت ( محمود اول ) بە کمال تعظیم و تبجیل تقدیس بکری و من الله التوفیق —

ریاست امنیت عمومیە

∴

تشکر و بیان ممنونیت

واوە عرض و بیانە کە جناب مندوب سامی حکومت فخیمۀ بریتانیا کە لە بغدادە بو ناردنەوەی حضرت ( حکمدار کردستان ) دام شوکتە بذل همتی فرمو و ایستایش بو انتظام حکومت کردستان و الحاق کردن او جیکایانە کە داخل کردستانن بە سلیمانی مشغولە . لە ام خصوصەوە وکو خبرمان زانیوە جناب میجر نویل وکیل فخامت مندوب سامی کە ایستا لە کرکوکە لەکل جناب میجر ادمونس مشاور کرکوك زور خیرخواه مات کوردن و بو ترقی حکومت علیۀ کردستان سعی و کوشش افرمون لبر امە عرض تشکر و بیان ممنونیتمان لە خذمتیانا هیە .

ریاست امنیت عمومیە

---

رئیس شرع و عدل

لە هیئت رؤسای ( قابینە ) حکومت کردستاندا تا ایستا ریاست شرع و عدل بە وکالت ایفا دکرا . امجارە بەنظر مستجمرات مخصوصەمانەوە لە بغداد لە مدرسین کرام و علمای بەنام عراق مرحوم و مشهور قرەطاغی ( لە داخلی سلیمانیایە ) شیخ عبد الرحمن افندی زادە شیخ علی افندی با ارادۀ حضرت حکمداری طالب و تعیین فرموراوە و ام ذاتەیش لە بغدادەوە حرکتی فرموە .

∴

لەسر ارادۀ علیۀ حضرت حکمداری تعلیمنامۀ طاقم عسکری کە لە طرف هیئت عسکریەوە بە کردی ترجمە کراوە لە مطبعۀ حکومتدا طبعی دردستە .

---

## اعلان رسمی

بو عموم آغا و کویخا و اهالی دیهات کردستان

دزی و جردەیی وسایر معاملات بی شرعی و بی معنا لم روزەدا لە هەمو وختی زیاتر عیب وگناهە جونکە امرو روز برایەتی و دوستی و خذمت دین و ملتە . بە تحقیق بزانن ام نوعە حرکانە بی معنایە نتیجۀ هر ندامت و پریشانیە . لە حدودوسنورمن دیهاتی دزی وجردەیی وسایرە رو بدات بەو دیهاتە تضمین اکری و اهالی او جیکایانە تجزیە اکری فاعلە کشی کەدوزرایەوە بنوعی تجزیە اکری کە ببی بە عبرت بو خوی بوهمو عالم و حتی طیارەش سوق اکریتە سر ام نوعە جیکایانە کە بومباردمانیان بکات . ابراوە ایترابی واز لم حرکات و معاملاتە بینن . لازم بو لە پیشەوە بوتان اعلان بکری .

۲۹ — ۱۰ — ۹۲۲                    ملك کردستان

محمود

---

[ بانگ کردستان ] ك ترکچە قسمی :

حقیقت کردستان

مابعد

بردە پهلویلرك ساسانیان طبقەسندن اولوب بین العرب ( یزدجرد ) اسمیلە معروف اولان پادشاهلرك اصل اسملری کردك خداوندی یعنی صاحبی معناسنە ( یزدکرد ) اولمغلە ادعامز وجهلە بو قومك موسوم اولدیغی کرد نامنك جنکیزدن دها قدیم ایدوکنی و بنابرین و بعضی اجنبی مؤرخلرك ادعاسی کبی کرد ویا

کرت کلمه‌سنك جنکیزلر زماننده غربی ایرانده بولنان اقوامه تعیین ایدلمش اولان اجنبی مامورلردن عبارت اولمادیغنی بزه صراحتاً کوستردیکی کبی نوشیروان و احفادی زماننده ایران قدیمك مهم بر قسمی کرد قومندن عبارت اولدیغنی اثبات ایدر .

---

## کردلرك ماضیسی

فرس قدیمك پهلوی عنصر اکری دیمك اولان کردلر بدایتلرده کردستانك شمالیده آزربایجان حوالیسیله آکباتان ( همدان قربنده ) جهتلرنده تأسیس حکومت ایدن و شمدیکی سلیمانیه قصبه‌سنك تمام شرقیسنده او تاریخلرده آیروجه بر حکومت شکلنده یاشایان آلانلرله برلشه‌رك بیوك بر سلطنت تأسیس وچوق دفعه‌لر آثوریلرله بابلیلری دخی حوزهٔ حاکمیتلرینه آلمغله آسیاده بیکلرجه سنه‌لر استقلالیتلرینی ابراز و حتی کندیلریله هم قوم همذهب اوله‌رق جنوبی کردستانده متمکن اولوب جوار حکومات سائره طرفندن محترم طانیلان فرس حکومتنه قارشو دخی تفوق و اقتدارینی اظهار ایلمش اولان مادلرك احفاد و انسالندن اولدقلری تواریخجه‌ده مضبوط اولدیغی کبی پهلویلرك ساسانیان دورنده‌کی پارلاق حکومتلری و ظهور اسلامدن صوکره دخی بیوك بر چوك متعدد مستقل کرد حکوماتی جهانك معلومی ایکن احوال عالمدن و حتی کرد اسمنك نه دیمك اولدیغندن و بو قومك عشایر و قبائلنك اسامیسی ملیلرندن خبردار اولمایان بعض جهلانك و یکی توره‌دیلرك کردلرك بر ماضی‌یه مالك اولمدقلری حقنده‌کی ادعالرینه قارشو اوزون او زادی‌یه بسط مطالعات ایتمکدن ایسه مختصر جوابله مقابله کافیدر که بو جوابده هر کرد ایچون مدار افتخاردر :

کردلر ظهور اسلامدن اول کیخسرو و نوشیروان و ظهور اسلامدن صوکره دخی جهانك مظهر حرمتی اولان سلطان صلاح الدین ایوبی و اك صوك زمانلرده ظهور ایدن کریم خان زند کبی عادل مدنی حکمدارلری کوسترمکله مستحسن ماضیلرینی یاد ایتدیرورلر . کردلرده ازمنهٔ قبل التأریخیه‌ده نمرودلر دخی چیقمشلر ایسه‌ده حضرت ابراهیمی یاقدران نمرودك عدالت عزمنده‌کی بر فضیلت غیره منکره‌سیله ینه کردلر افتخار ایده بیلورلر شویله که او زمان دنیانك اك بیوك حکمداری اولان نمرودلر ( مصرده فرعونلر ادعای الوهیت ایتدکلری کبی ) کردستانده قوم نظرنده اولمز و باقی اولدقلری ظن ایدلدکلرندن کردجه‌ده اولمز معناسنه کلان نمرود لقبیله طانیلمشلردی . ایشته بو نمرودلردن بریسی قومنك آیین مقدسنه قارشو عظیم بر تجاوزده بولنان و کندی تبعه‌سندن بریسنك اولادی اولان حضرت ابراهیمی حضورینه جلب ایتمش و قران عظیم الشانده رب العبادك بیانندن اکلاشیله‌جغی اوزره هیچ بر تحقیرات یاپدیرمزدن اول جرم واقعك اعترافنی علی ملاء الناس دیکله‌مش یعنی ابراهیم علیه السلامك استجواب و محاکمه‌سینی یولیله اجرا و ایفاسندن صوکره محضاً او زمانك قانوننده اجرای معدلت نیتیله تجزیه‌سنه امر ایتمشکه بو عادلانه معامله تاریخ نقطهٔ نظرندن تنقید ایدیله‌مز .

ینه تواریخك شاهد اولدیغی اوزره بابلی ضبطندن صکره کلدانی معبودلرینه حرمت ایدوب یهودیلری اسارتدن قورتاره‌رق معبدلرینك اعمارینه مساعده و بخت النصرك قدسدن آلمش اولدیغی قیمتلی اشیای مقدسه‌یی او مظلوم قومه اعاده ایدن پهلوی قدیمدن کیخسرو ضبط ایتدیکی ولایاتده دیانتك لسانك عادات ملیه‌نك تمامل محلیه‌نك سربست براقلمسنه حتی اردولرده بولنان مختلف قوملرك کندی قیافت ملیلرینی شدیده ملابسه اکسالرینه عدالت نامه اوزره محاکماتك جریانه و ویرکولرك شکل اراضی‌یه اهالینك درجه تحملنه کوره تعیینه باقیلدن آیلرجه مسافه‌ده اولان مصر کبی اوزاق

و مذهب و اخلاقجه کندی قومنه کلیاً مباین اولان بر دیاره کیرر کیرمز اهالیسنك رفاه ؤ سعادتی ایچون کافهٔ مشکلاتی اقتحام ایله برابر قانالر حفرینه یوللر انشاسنه بیوکلك کوسترمشدرکه بو معامله‌لری بوکونکی مشاهیر حکمداران ایچون نمونهٔ امتثال اولمسنه شایاندر .

کردی و کرجی کلمه‌لرینك آره‌لرنده‌کی
مناسبات لفظیه و بو بابده‌کی مطالعه

روس متتبعینجه کرد ایله — کرج — آره‌سنده مناسبت لفظیه اولدیغی وحتی بعض تاریخلرده کردلر قدیم زمانده بر قاچ دفعه عموم قفقاسی بیله ید ضبطه کچیرمش اولدقلری ادعا اولنور . و فی الحقیقه آخسخه قارص ، ووان ، باکو وحتی باطومه یقین محللرده اهمیتلی مقدارده کرد بولونشنه وکرده بریای نسبی علاوه‌سیله کرجی‌یه لفظاً مشابهتنه نظراً پهلویلرك کرجستانیده استیلا ایتمش اولدقلری هنکامه‌لرده رأس کاره کچمش و امور اداره‌یی الده آلمش اولان کردلره اضافتاً اهالیسنه کردی ، کرجی دینلمش اولمسی وارد خاطر اولیورسه‌ده لفظاً اولان بو وجه شباهتك حقیقتی آکلامق ایچون اوزون تتبعاته متوقفدر شرفنامه‌نك بیاناتنه استناداً دقتور فریچ دخی کندی اثرنده قفقاس جنوبیسنده‌کی کردلرك وقتیله مستقل حکومتلر اولدیغنی ذکر ایله‌مشدر .

مابعدی وار

بو صفر

کردستان شمالیده « امیر » نامنده بر کرد ادیب محترمنك مطبعه‌مزه ارسال بیوردیغی —

بر صدای حق

یوقدر جهان سینه‌سنه عالمده آشنا
سرجستوجوی حقه ؟ بیوك درده مبتلا ...
طوپلرله ، بومبالرله ، یه‌کلماز کلام حق .
کورنماز قلوب غالبه کذب و ریا دوا ...
قصده ؟ هوایه ، حسه کوره حق دکشمه‌ده
هر برده کرهاً اولمه‌ده حق باطله فدا .
خدمت ایدر تغلبه هر کس حقو قیون ...
صوصمش و میل ایدر بوکا هیچ ایتمادن حیا
حقك ، صربوتك بری یوق ، کرده ، بزده
ارباب حقه یاوری سك اول یاور ، ای خدا !
هپ لوث حرص نفع و ریا ... هر طرف جهان
آلودهٔ فضاحت و بطلان و افترا ..
وجدانی ، قلبی ، حوصله‌سی ، بونجه خلقك اه !
طاشدنمیدر ؟ نه‌در بو ! الاهی نه ابتلا !
دهرك خطای رؤیت و قهرنده بی حضر
انصافی رهبر ایتملی وجدانه اقتدا ! ...
هر ملت الده ایتمده کندی حقوقنی ،
یوقمی شو امسکی ملته بر حق اعتلا !
کردك مقدراتی سیاست کهی دول
بعد محرد کده دها بر کوچك سما
املکی ، حیاتی ، ثروتی بر ظلم بی امان
دست تغلبنده ... دها بولمادی رها ،
بر عصر اصطفا دینه‌جك عصر حاضره
عاطللری ازوب سیله‌جك عصر اصطفا !..
نور هدایتکله اویاندر شو ملتی و —
جهل و تعصبی ییقان ای دین مصطفی ! —
آه ای زواللی ملتم ای کرد بی‌خبر !
ای غم کسار محنت و قهر و شر و جفا ! ...
یورت ، آت ، ردای مسکنتی ، بار محنتی .
ای کرد ایت شهامت و عزمکله ارتقا !
الله رضاسنه ، پیغمبر عشقنه ،
آرتق براق نفاق و شقاقی ، یتر دها

